





# پەروەردەکردنی منداڵ لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا


نوسینی: عبدالسلام بن عبدالله السلیمان

پێشەکی زانای پایەبەرز: صالح بن فوزان الفوزان

وەرگێڕانی:
هشام لطیف

پێداچوونەوەی:
م. صلاح الدین عبدالکریم



1441کۆچی
2020زانیی




**نــاوی کتێــب: پــەروەردەکردنی منــداڵ لــە ژێــر ڕۆشــنایی قورئــان‌و سوننەتدا**

**نوسینی:** عبدالسلام بن عبد الله السلیمان

**پێشەکی زانای پایەبەرز:** صالح بن فوزان الفوزان

**وەرگێڕانی:** هشام لطیف

**پێداچوونەوەی:** م . صلاح الدین عبدالکریم

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی زانای پایەبەرز صالح بن فوزان الفوزان:

**الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على نبينا محمد وآله وصحبه وبعد:**

**ئـەم كتێبـەم خوێنـدەوە كـە نوسـەرەكەی الشيخ عبد السلام بن عبد الله السليمان كە ناونیشانی کتێبەکە: (تربية الأولاد في ضوء الكتاب السنة) بينـيم كتێبێكی بەسودەو گرنگە لەم بابەتە بە باشی نوسيوێتیو سودی گەيانـدووە، خـوای گـەورە پاداشـتی خێـری بداتـەوە وە سـوود بگەيـەنێت بـەوەی كـەوا نوسيوێتی.**

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه.**

**نوسینی:**

صالح بن فوزان الفوزان

عضو هيئة كبار العلماء

**لە ١٤٢٦/٤/٥ كۆچی**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی نوسەر:

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله ﷺ، وعلى آله وصحبه ومن والاه

له پاشان:

خوای گەورە بەخششی زۆری هەیە بەسەر بەندەکانی خۆیەوە، یەكێك لـە گەورەترین نیعمەتـەکانی منـداڵێكی چاکە، کـە کـردەوەی دایـك‌و بـاوكێتی لـە ژیانیان‌و لـە پـاش مردنیـان، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هەواڵیـداوە لـە فەرمودەکەی أبـو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) « إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ ... أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ »[1].

واتە: کاتێك کە نەوەی ئادەم مـرد ئـەوا کردەوەکـانی دەبـچڕێت جگـە لـە سێ ڕێگەوە نەبێت) باسی کردن (یان منداڵێكی چاك کە دوعای خێر بـۆ دایـك‌و باوكی بکات).

هەر بۆیە پێغەمبەران (سـەلامی خوایـان لێبێـت)و پیاوچـاکان گرنگییـەکی گەورەیان داوە منداڵ، لەبەر ئەو خێرە گەورەیەی بە دەستدەکەوێت.

زۆرێـك لـە خـەڵكی ئـەم کارەیـان پـشتگوێ خـستوە وە بەتایبـەت لـەم سـەردەمەدا لەگـەڵ زۆری هۆکـاری خۆشـییەکان‌و سـەرقاڵبوون‌و فیتنـە، وە

---

[1] حديث صحيح: صحيح الجامع الصغير، رقم الحديث: (٧٩٣).

بێئاگایی زۆرێك لەوان لە ڕێنمایی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ڕونو ئاشكرایە لە پەروەردەكردنی منداڵ، كە یەكێكە لە گرنگترین ئەو شتانەی پێویستە لەسەر كەسی موسڵمان گرنگی پێبداتو شوێنی بكەوێتو ئەو هۆكارانە بگرێتەبەر كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنماییداوە بۆ پەروەردەكردنی منداڵ.

وە ئەمە كتێبێكی بچوكە كۆمكردوەتەوە لەوەی كە بۆم ئاسانكرا لە قورئانو فەرمودە لە پەروەردەكردنی منداڵ، بەڵكو ببێتە هۆكارێك بۆ یارمەتیدانو ڕێنماییەك بێت بۆ دایكو باوك لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان، داوا دەكەم لە خوای گەورە كە تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت، هەروەكو چۆن لە بیری ناكەم كە سوپاسی شێخمان الشیخ/ صالح بن فوزان الفوزان بكەم كە پێشەكی بۆ ئەم پەرتوكە نوسیوە، داوا دەكەم لە خوای گەورە كە بیكاتە تای تەرازوی كردەوە چاكەكانی، وە بیكاتە بەرەكەت لە كاتەكانیو عیلمەكەی.

عبدالسلام بن عبد الله السليمان

المدير العام

لمؤسسة الدعوة الخيرية

## منداڵ نیعمەتێكە لە نیعمەتو بەخششەكانی خوای گەورە:

الْهِبَة: بوون بە خاوەنی شتێك بێ بەرانبەر.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴾ [الشورى: ٤٩ - ٥٠].[٢]

واتە: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ مولكی ئاسمانەكانو زەوییەكان هەموی تەنها مولكی خوای گەورەیەو خوای گەورە ویستی لێ بێت هەر شتێك دروست بكات دروستی ئەكات ﴿يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا﴾ خەڵكی وا هەیە خوای گەورە تەنها كچی پێ ئەبەخشێت وەكو لوط پێغەمبەر ﷺ ﴿وَيَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ﴾ وە هەیشە تەنها كوڕی پێ ئەبەخشێت وەكو ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا﴾ یان هەیشە كوڕو كچی پێ ئەبەخشێت وەكو پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿وَيَجْعَلُ مَنْ يَشَاءُ عَقِيمًا﴾ وە هەیشە هیچی پێ نابەخشێت وەكو یەحیا پێغەمبەر ﷺ ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوای گەورە زۆر زاناو بەتوانایە، ئادەمی بەبێ دایكو باوك دروستكردوە، وە حەوای لە ئادەم دروست كردوە، وە عیسای بەبێ باوك دروست كردوە، وە سەرجەم مرۆڤی لە دایكو باوك دروستكردوە.

---

[٢] تەفسیری ئایەتەكان لە تەفسیری ڕێبەر وەرمگرتووە، ئامادەكردنی مامۆستای بەڕێزو خۆشەویستم مامۆستا صلاح الدين عبدالكريم، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە.

ابن عطية لە تەفسیرەكەی (المحرر الوجين)[٣] فەرموویەتی: خوای گەورە سەرەتا دەستی پێكردوە بە باسكردنی كچ ئەمە ڕێزێكە بۆیان، بۆئەوەی گرنگیان پێبدرێت وە چاكەیان لەگەڵدا بكرێت، وە واثلة كوڕی أسقع (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: لە بەرەكەتی كچ ئەوەیە كە باسكراوە پێش باسكردنی كوڕ، لەبەرئەوەی خوای گەورە دەستی پێكردوە بە باسكردنی كچ. من يمن المرأة واتە: لە بەرەكەتو نیشانەی خۆشبەختی لە دونیا پێش قیامەت.

## خەڵكی چوار بەشە:

إسحاق كوڕی بشر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پاشان بوو بەگشتی:

١- پێغەمبەر لوط (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ): باوكی ئافرەت بوو كوڕی نەبوو.

٢- وە پێغەمبەر إبراهيم (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ): باوكی كوڕ بوو كچی نەبوو.

٣- وە پێغەمبەر محمد ﷺ: منداڵی هەبو لە هەردو ڕەگەز.

٤- وە پێغەمبەر يحيا كوڕی زەكەريا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) منداڵی نەبوو.[٤]

---

(٣) (٤٣/٥). الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت. المحقق: عبدالسلام عبد الشافي محمد.

(٤) المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز = تفسير ابن عطية (٤٣/٥). الناشر: دار الكتب العلمية - بيروت. المحقق: عبدالسلام عبد الشافي محمد.

ژنهێنان لەم ئایەتەدا ﴿ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗا ﴾ [الشورى: ٥٠].

ئەوە کۆکەرەوەیە لە نێوان کوڕو کچ.

## منداڵ ڕازاوەو جوانییە وە بەڵاو تاقیکردنەوەیە:

### ١- منداڵ ڕازاوەو جوانییە:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا ﴾ [الكهف: ٤٦].

واتە: ﴿الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ماڵ و منداڵ جوانی و ڕازاوەیی ژیانی دونیان ﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ بەڵام ئەوانەی کە ئەمێننەوە لە چاکەکان‌و لە زیکر کردن (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) یاخود نوێژە جەماعەتەکان یان هەر کردەوەیەکی چاك ئەوانە باشترە کە مرۆڤ بیکات‌و لای خوای گەورە پاداشتی باشترە ﴿وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾ وە باشترین شتە کە مرۆڤ ئومێدی پێی هەبێت.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ ﴾ [آل عمران: ١٤].

واتە: بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوەو جوانکراوەو لەلایان خۆشەویستکراوە ئەو شتانەی کە ئارەزووی تیایەو دڵ پێی خۆشە لە ئافرەت‌و کوڕ.

## ٢- منداڵ بەڵاو تاقیکردنەوەیە:

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ [التغابن: ١٥].

واتە: بەڕاستی ماڵ و منداڵتان تاقیکردنەوەیەو خوای گەورە بەهۆی ماڵ و منداڵەوە تاقیتان ئەکاتەوە.

بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ يَخْطُبُ إِذْ أَقْبَلَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ قَالَ: فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَمَلَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: " صَدَقَ اللَّهُ {إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ} [التغابن: ١٥]، إِنِّي رَأَيْتُ هَذَيْنِ الْغُلَامَيْنِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى نَزَلْتُ وَحَمَلْتُهُمَا » رواه أبو داود[٥].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر بوو وتاری دەدا، حەسەن و حوسێن (ڕەزای خوایان لێبێت) منداڵ بوون هاتن و دەکەوتن، هەردوکیان قەمیسی سوریان لەبەر بوو دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکەی دابەزی و هەڵیگرتن و فەرمووی: خوای گەورە راستی فەرمووە کە " ماڵ و منداڵ تاقیکردنەوەن" [التغابن: ١٥] من ئەم دوو منداڵەم بینی دەڕۆشتن و دەکەوتن، خۆم بۆ نەگیرا هەتا دابەزیم و هەڵمگرتن.

---

(٥) حديث صحيح: أَخْرَجَهُ أَبو داود (١١٠٩)، وابن ماجه (٣٦٠٠)، والترمذي (٣٧٧٤)، من حديث بُرَيْدَةَ بْنُ الْحَصِيب، وقال الترمذي: حسن غريب، وَهوَ فِي "مُسْنَدُ أَحْمَد" (٣٨/٩٩-١٠٠). بەڵام ئەم ڕیوایەتە لە (ابن خزيمة) **هاتووە**: رقم الحديث: (١٤٥٦) [صحيح وضعيف سنن الترمذي: (٣٧٧٤)].

## ٣- منداڵ دایك‌و باوك سەرقاڵیان دەكەن لە گوێڕایەڵی خوای گەورە:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ [المنافقون: ٩].

واتە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ ئەی باوەڕداران با ماڵ و منداڵتان سەرقاڵتان نەكەن لە زیكرو یادی خوای گەورەو لە قورئان خوێندن‌و لە ئەنجام دانی فەرزەكان ﴿وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ وە هەر كەسێك وا بكات‌و سەرقاڵ بێت بە دونیاوەو دونیا سەرقاڵی بكات لە عیبادەت و دینداری و زیكری خوا ئا ئەو كەسانە بەڕاستی خۆیان زەرەرمەندن.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡ ﴾ [التغابن: ١٤].

واتە: ئەی باوەڕداران لەناو خێزانەكان‌و منداڵەكانتاندا كەسانێك هەن كە دوژمنی ئێوەن لەبەر ئەوەی ڕێگریتان لێ ئەكەن لە خێرو چاكە، یان تووشی تاوانتان ئەكەن جا ئاگاداریان بن‌و لەو شتانەدا بە قسەیان مەكەن.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « **الأَولادُ**[٦] **مَجبَنَةٌ مَبْخَلَةٌ** »[٧].

واتە: منداڵ دەبێتە مایەی ترسنۆکیو چروکی.[٨]

**مَجبَنَةٌ**: دەترسێت لە جیهاد کردن لە ترسی مردن.

**مَبْخَلَةٌ**: ڕێگری دەکات لە خێرکردن لە پێناو بەخشین بە منداڵەکانی، چروکی دەکات.

---

(٦) ئەو ڕیوایەتە بەم شێوە نیە، بەڵکو بە: «إِنَّ الْوَلَدَ ... » - وەرگێڕ-

(٧) أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ فِي "الْمُسْنَد" (٢٩/١٠٤) (١٧٥٦٢)، وَابْنُ مَاجَه: (٣٦٦٦) مِنْ حَدِيث يَعْلَى بن مرة الْعَامِرِيِّ ﷺ بِلَفْظِ: «إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ» واتە: جێی ڕەزیلیو ترسنۆکییە، واتە: وا لە ئینسان دەکات هەڵگری ڕەزیلیو ترسنۆکی ببێتو داوای ئەوە دەکات، ڕەزیلی دەکات بە ماڵەکەی، وە واز لە جیهاد دەهێنێت لە ترسی مردن لەبەر منداڵەکانی. ئەم ڕیوایەتە: «إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ ». حَديثٌ صَحيحٌ: صحيح الجامعُ الصَّغير وَزِيادتهُ: رقم الحديث: (١٩٨٩).

(٨) واتە: وا لە ئینسان دەکات هەڵگری ڕەزیلیو ترسنۆکی ببێتو داوای ئەوە دەکات، ڕەزیلی دەکات بە ماڵەکەی، وە واز لە جیهاد دەهێنێت لە ترسی مردن لەبەر منداڵەکانی. -وەرگێڕ-

# پاڕانەوەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت)و پیاوچاکان لە خوای گەورە بۆ ئەوەی منداڵی چاکیان پێببەخشێت

## پاڕانەوەی پێغەمبەر زەکەریا(سەلامی خوای لێبێت):

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ [آل عمران: ٣٨].

واتە: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ﴾ لەوێدا زەکەریا ﷺ کە بینی خوای گەورە ئەو ڕزقەی بە مەریەم بەخشیوە ئەوکاتە هیواو ئومێدی زیاتر بوو کە خۆی پیرەمێرد بوو، وە خێزانەکەی پیرەژنێکی نەزۆك بوو، دوعای کردو لە پەروەردگار پاڕایەوە ﴿قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ فەرمووی: ئەی پەروەردگار لەلایەن خۆتەوە نەوەیەکی پاك‌و چاکم پێ ببەخشە بە دڵنیایی تۆ هەموو دوعایەك ئەبیستی وە وەڵام ئەدەیتەوە.

## وە لە پاڕانەوەی پیاوچاکان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت):

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ [الفرقان: ٧٤].

واتە: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ وە ئەو کەسانەی ئەڵێن: ئەی پەروەردگار لە خێزانەکان و منداڵەکانمان چاوروناکیمان پێ ببەخشە کە ببنە هۆی ڕووناکی چاومان بەوەی کە تاعەت‌و عیبادەتی تۆ بکەن ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ وە بمانکە بە پێشەوا بۆ ئەو کەسانەی کە تەقوای خوای گەورە ئەکەن‌و لە چاکەدا خەڵکی چاومان لێ بکەن.

# سودی منداڵی چاك

## منداڵ نیعمەتێكە لە نیعمەتەكانی خوای گەورە:

پێغەمبەری خـوا ﷺ: « إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ: إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ »[٩].

واتە: كاتێك ئینسان مرد كردەوەكانی كۆتایی پێدێت جگە لە سێ ڕێگـاوە نەبێت: خێرێكی بەردەوام، یان زانست‌و زانیارییەك كە سودی لێ ببینرێت، یـان منداڵێكی چاك دوعای خێری بۆ بكات.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « إِنَّ الرَّجُلَ لَتُرْفَعُ دَرَجَتُهُ فِي الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: أَنَّى هَذَا؟ فَيُقَالُ: بِاسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ »[١٠].

واتە: بەڕاستی كەسی وا هەیە لە بەهەشتدا پلەو پایەی بەرز دەكرێتەوەو دەڵێـت: ئەمـە بۆچـی؟ پێـی دەوترێـت: بـەهۆی ئـەوەی منداڵەكـەت داوای لێخۆشبوونی بۆت كرد.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « سَبْعٌ يَجْرِي لِلْعَبْدِ أَجْرُهُنَّ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ، وهُو فِي قَبْرِهِ: مَنْ عَلَّمَ عِلْمًا، أَوْ كَرى نَهْرًا، أَوْ حَفَرَ بِئْرًا، أَوْ غَرَسَ نَخْلا،

---

(٩) أَخرَجهُ مُسلِمٌ: (١٦٣١) (١٤) وَأبو داود (٢٨٨٠)، والتِّرمذيُّ (١٣٧٦)، وابنُ ماجه (٢٤٢)، والنسائي (٣٦٥١)، مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وهُوَ فِي "مُسنَد أحمد" (٤٣٨/١٤) (٨٨٤٤).

(١٠) حَدِيثٌ صَحِيحٌ: أَخرَجَهُ أَحْمَد فِي"الْمُسْنَد" (٣٥٦/١٦-٣٥٧) (١٠٦١٠)، وابنُ ماجه (٣٦٦٠). وسلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم الحديث: (١٥٩٨).

أَوْ بَنَى مَسْجِدًا، أَوْ وَرَّثَ مُصْحَفًا، أَوْ تَـرَكَ وَلَدًا يَسْتَغْفِرُ لَهُ بَعْدَ مَوْتِهِ ». **حديث حسن أخرجه ابن ماجه وابن خُزَيمة**[11].

**واتە: حەوت شت پاداشتی بۆ خاوەنەكەی دەڕوات لە پاش مردنی، كە ئەو لە گۆڕدایە: زانستێكی فێر خەڵكی كردبێت، یان جۆگاو ڕوبارێكی ئاوی ڕاكێشابێت، یان بیرێكی ئاوی هەڵكەندبێت، یان دار خورمایەكی ناشتبێت، یان مزگەوتێكی دروست كردبێت، یان قورئانێكی بە جێهێشتبێت، یان منداڵێكی چاكی بەجێهێشتبێت دوعای خێری بۆ بكات پاش مردنی.**

---

(11) حديثٌ حَسَنٌ: أخرجه أبو نعيم في "الحِلية" (٢/٣٤٤)، والبيهقي في "الجامع لشعب الإيمان" (٥/١٢٢-١٢٣) (٣١٧٥) وأورده المنذري "الترغيب والترهيب" (١/١٢٤) (١١٣)، و (١/١٧٥) (١٤٠٨)، و (٣/٣٥٦-٣٥٧) بأثر الحَديث (٣٨٢٨)، مِنْ حَديث أَنَسٍ ﷺ. [صحيح الترغيب والترهيب: رقم الحديث: (٩٥٩)].

و حَديث أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا عَلَّمَهُ وَنَشَرَهُ، وَوَلَدًا صَالِحًا تَرَكَهُ، وَمُصْحَفًا وَرَّثَهُ، أَوْ مَسْجِدًا بَنَاهُ، أَوْ بَيْتًا لِابْنِ السَّبِيلِ بَنَاهُ، أَوْ نَهْرًا أَجْرَاهُ، أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِهِ فِي صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ، يَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ ». حَديثٌ حَسَنٌ: مِشْكاةُ المَصابيح، رقمُ الحديث: (٢٥٤).

**واتە: بەڕاستی ئەوەی كە بە باوەڕدار دەگات لە كردەوەو چاكەكانی لە پاش مردنی: زانیارییەكە كە بڵاوی كردبێتەوە، وە منداڵێكی چاكە كە بەجێی هێشتبێ، وە قورئانێكە كە جێی هێشتبێ، یان مزگەوتێكی دروست كردبێت، یان ماڵێكی بۆ ڕێبواران دروست كردبێت، یان بیرو ڕوبارێكی كردبێت، یان خێرێك لە ماڵی خۆی دەری كردبێت لە كاتی لەشساغی و ژیانی خۆیدا، لە پاش مردنی ئەمانەی پێ دەگات.**

# واجبێتی پەروەردەكردنی منداڵ

واجبە لەسەر باوكانو دایكان گرنگیو بایەخ بە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان بدەن لەسەر چاكبوونیان، بۆ ئەوەی كردەوەی چاك ئەنجام بدەنو سودیان پێ بگەیەنێت لە ژیانو دوای مردنیان.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ... ﴾ [التحريم: ٦].

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتانو ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سووتەمەنییەكەی خەڵكیو بەردە، یاخود بەردەكە مەبەست پێی بتەكانە، خەڵكیش ئەچێتە ئاگری دۆزەخ وە ئەو بتانەیش كە ئێوە ئەتانپەرستنو كردبوتانن بە خوای خۆتان هەموی لە دۆزەخدا ئەبن بە سوتەمەنی بۆ ئێوەو ئاگری جەهەننەمی پێ خۆش ئەكرێ و ئێوەی پێ ئەسوتێنرێ، جا خۆتان و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لەو ئاگرە بەوەی پەروەردەیەكی جوانیان بكەنو فێرە دینیان بكەنو فەرمانیان پێ بكەن بە چاكەو ڕێگریان بكەن لە خراپە بۆ ئەوەی نەچنە ناو ئەو ئاگرەوە

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾ [طه: ١٣٢].

واتە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ﴾ وە تۆ فەرمان بە كەسوكارت یان بە ئوممەتەكەت بكە بە نوێژ كردن ﴿وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ وە ئارام بگرە لەسەر نوێژ كردنەكەت ﴿لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ ئێمە داوای ڕزق و ڕۆزی لە تۆ ناكەین

بەڵكو ئێمە ڕزق و ڕۆزی تۆ ئەدەین، (خوای گەورە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرمێت: ئەی ئادەمیزاد خۆت بۆ پەرستنی من یەكلا بكەوە دڵت پڕ دەوڵەمەندی دەكەمو هەژاریت ناهێڵم، ئەگەر وانەكەیت دڵت پڕ سەرقاڵی دونیا دەكەمو هەژاریت بۆ پڕ ناكەمەوە) ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى﴾ وە سەرەنجامیش كە بەهەشتە تەنها بۆ ئەهلی تەقوایە.

لە ابن عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا، وَالخَادِمُ رَاعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ» وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»[١٢].

واتە: هەمووتان شوانو بەرپرسن وە هەموتان بەرپرسن لەژێر دەستەكانتان، ئیمام و پێشەوا شوانو بەرپرسە لەژێر دەستەكانی، وە پیاو لە ماڵی خۆی شوانەو بەرپرسەو لێپرسراوە لە ژێر دەستەكانی، وە ئافرەت لە ماڵی پیاوەكەی شوانەو بەرپرسە وە لێپرسراوە لەژێر دەستەكانی، وە خزمەتكار شوانەو بەرپرسە لە ماڵی گەورەكەی وە بەرپرسە لەژێر دەستەكانی، هەموتان شوان و بەرپرسن و هەموتان لێپرسراون لەژێر دەستەكانتان.

---

(١٢) أخرجه البُخاريُّ (٢٥٥٤)، ومُسلِمٌ (١٨٢٩) (٢٠) وأحمدُ فِي "المُسْنَد" (٨/٨٣) (٤٤٩٥).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِين، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ »[13].

واتە: فەرمان بە منداڵەكانتان بكەن بە نوێژ كردن لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، وە لێیان بدەن لەسەری ئەگەر نەیانكرد كە تەمەنیان گەیشتە دە ساڵ، وە جێگای نوستنیان لێك جیا بكەنەوە.

## هیدایەت و ڕێنومایی دوو جۆرە

زۆرێك لە خەڵكی ئەو هۆكارانە ناگرنەبەر كە یارمەتیدەریانە لەسەر پەروەردەكردنی منداڵەكانیان، وە ئەو هۆكارانە ناگرنەبەر كە منداڵەكانیان ڕادەهێنێت لەسەر تەقوای خوای گەورە و خۆشەویستی كاری چاكە، بۆیە منداڵەكانیان دەكەوێتە تاوانەوە بە هۆكاری ئازاردانی خەڵكی.

### هیدایەت و ڕێنومایی دوو جۆرە:

### ١- هیدایەت و ڕێنومایی و ڕونكردنەوە:

ئەمە داواكراوە لەسەر هەموو خەڵكی، ئەویش نیشانە و ئامانجی خەڵكییە بۆ خێر، وە سووربوونیانە لەسەر كارو كردەوەی خێرو وازهێنان لە تاوان، ئەویش لەم ئایەتەی خوای گەورە باسكراوە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ [الشورى: ٥٢].

---

(١٣) حَديثٌ حسنٌ: أخرجه أبو داود (٤٩٥)، وأحمد في "المُسند" (١١/٢٨٤-٢٨٥) (٦٦٨٩) مِنْ عَبد الله بن عَمْرو رضي الله عنه. صحيح الجامع الصغير وزيادته، رقمُ الحديث: (٥٨٦٨).

واتـە: وە تـۆ ئـەی محمـد ﷺ هیدایـەتی خـەڵکی ئـەدەیت و ڕێنماییـان ئەکەیت بۆ ڕێگای ڕاستی خوای گەورە.

## ٢- هیدایەتدان و وەرگرتنی:

ئەمە هیچ کەسێك بە دەستی نییـە جگـە لـە خـوای گـەورە، لەبەرئـەوەی خوای گەورە خۆیـەتی هیدایـەتی کەسـێك دەدات بـە ڕەحمـەتی خـۆی، خـوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾ [القصص: ٥٦].

واتە: ئەی محمد ﷺ بە دڵنیایی تۆ ناتوانی هیدایەتی کەسـێك بـدەی کـە خۆشت ئەوێ.

وە فەرموویەتی: ﴿إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ﴾ [الشورى: ٤٨].

واتە: بەڵکو تەنها ئەوەندەت لەسەرە دینەکەی خوای گەورە بگەیەنی.

وە فەرموویەتی: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾ [البقرة: ٢٧٢].

واتە: هاوەڵان بـە خزمـە هاوبەشـبڕیاردەرەکانیان نابەخـشی خـوای گـەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند، ئەی محمد ﷺ هیدایەتی خەڵکی لەسـەر تـۆ نییـە تـەنها ئەوەندەت لەسەرە کە دینەکەیان پێ بگەیەنی و تەبلیغیان بکـەیت بـەڵام خـوای گەورە خۆی هیدایەتی هەر کەسێك ئەدات کە وویستی لێ بێت و شایانی بێت.

# هەنگاوە کردارییەکان بۆ پەروەردەکردنی منداڵ

## ١- یەکەم شت دەست پێدەکەین لە چاککردنی نەفسی خۆمان:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارًا﴾ [التحريم: ٦].

واتە: ئەی باوەڕداران خۆتان‌و ماڵ و منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سووتەمەنییەكەی خەڵكی‌و بەردە.

چاكبوونی باوك دایك لە دیارترین هۆكارەكانی یارمەتیدانە لەسەر پەروەردەكردنی منداڵ، لەبەرئەوەی ئەوان پێشەنگن، وە منداڵیش چاو لە دایكان‌و باوكانیان دەكەن.

كوڕ چاو لە باوكی دەكات، وە كچیش چاو لە دایكی دەكات.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖ﴾ [الطور: ٢١].

واتە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ وە ئەو كەسانەی كە ئیمانیان هێناوەو منداڵەكانیشیان شوێنیان كەوتوون بە ئیمانەوە بەڵام منداڵەكانیان كردەوەی چاكیان وەكو ئەوان نییە لە شوێنی تر لە پلەكانی خوارەوەی بەهەشتن خوای گەورە ئەفەرمووێ وەكو ڕێزێك بۆ دایك‌و باوكیان منداڵەكانیشیان پلەیان بەرز ئەكەینەوە وە ئەیانگەیەنین بە یەكتری ﴿وَمَا أَلَتْنَاهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ﴾ بەڵام لە كردەوەی دایك‌و باوكان هیچ كەم ناكەین كاتێك كە منداڵەكانیان پێ ئەگەیەنین.

## ٢- هەڵبژاردنی هاوسەر:

ئەو کەسەی دەیەوێت بەروبوومەکەی پێگەیشتوو باش بێت دەگەڕێت بە دوای زەوییەکی چاکدا.

لە حیکمەتە گەورەکانی ژنهێنان خستنەوەی منداڵی ڕەسەن و چاکە کە خوای گەورە بپەرستن وە ببنە زەخیرەو سەرمایەیەك بۆ باوك و دایکیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « تَزَوَّجُوا الْوَدودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ » رواه أبو داود [١٤].

واتە: ئەو ئافرەتانە بهێنن کە خۆشەویستیان هەیە بۆ مێردەکەیان و زۆر منداڵیان دەبێت چونکە بە زۆری ئێوەوە شانازی بەسەر ئوممەتەکانی تر دەکەم.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕونیدەکاتەوە خەڵکی لەبەرچی ژن دەهێنن، دەفەرمووێت: « تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ »[١٥].

واتە: لەبەر چوار هۆکار ژن دەهێنرێت: لەبەر سەروەت و سامانەکەی، وە لەبەر ڕەسەن و ناوداریتی،وە جوانییەکەی،وە دینەکەی، جا خۆت

---

([١٤]) حَديثٌ صحيحٌ: أخرجه أبو داود (٢٠٥٠)، والنسائي (٣٢٢٧)، مِنْ حَديث مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ رضي الله عنه، وصححه ابن حبان (٤٠٥٦) و (٤٠٥٧). صحيح وضعيف سنن أبي داود، رقمُ الحَديث: (٣٠٥٠)، وَ مِشكاةُ المصابيح، رقمُ الحَديث: (٣٠٩١).

([١٥]) أخرجه البخاري (٥٠٩٠)، ومسلم (١٤٦٦)، وأبو داود (٢٠٤٧)، والنسائي (٣٢٣٠) وأحمد في "المسند" (١٥/٣٩٠) (٩٥٢١).

بەختەوەربکە بە هەڵبژاردنی دیندارەکە ئەگەر ئەمەت هەڵنەبژارد ئەوا دەستت بە خۆڵدا بچێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱلصَّـٰلِحَـٰتُ قَـٰنِتَـٰتٌ حَـٰفِظَـٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ ﴾ [النساء: ٣٤].

واتە: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ﴾ ئەو ئافرەتانەی کە چاکن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خواو ﷺ پاشان مێردەکانیشیان ئەکەن ﴿حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ﴾ وە لە کاتی ئامادە نەبونی مێردەکانیاندا لە ماڵەوە بە پارێزگاری خوای گەورە خۆیان و منداڵیان ئەپارێزن وە ماڵی مێردەکانیان ئەپارێزن.

الْقَانِتَاتٌ: گوێڕایەڵی مێردەکانیان دەکەن، پارێزگاری لە مێردەکانیان دەکەن لە کاتێکدا ئامادەنەبن وەلە ماڵەکانیان‌و لە نەفسی خۆشیان.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاری کردوینەتەوە لە ئافرەتێکی ڕوکەش جوان‌و ڕەچەڵەك خراپ، فەرمویەتی: « إِيَّاكُمْ وَخَضْرَاءَ الدِّمَنِ» ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا خَضْرَاءُ الدِّمَنِ؟ قَالَ: «الْمَرْأَةُ الْحَسْنَاءُ فِي الْمَنْبَتِ السُّوءِ » رواه الدارَقُطني[١٦].

---

(١٦) [ضَعيفٌ جِدًّا: سلسلة الأحاديث الضعيفة (١/٦٩) رقم الحديث: (١٤)]. رواه الدارَقُطني في "الأفراد" من حديث أَبِي سَعِيدٍ ﷺ مَرفوعاً وأورده العجلوني في "كَشفُ الخفاء" (١/٣١٩) (٨٥٥)، ومعناه أنه كره نكاحُ ذات الفساد، فإن أعراق السوء تنزع أولادها، وأصلهُ أن النبات ينبت على البعر في الموضع الخبيث، فيكون ظاهره حسنا، وباطنه فاسداً، إذِ الدِّمَن جمعُ دمنة، وهي البعر.

واتە: ئاگادارتان دەكەمەوە لە خَضْرَاءَ الدِّمَنِ (گیایەك لەسەر پاشەڕۆی ئاژەڵ ڕوابێت)، فەرمویان: خَضْرَاءُ الدِّمَنِ چییە؟ فەرموی: ئافرەتێك لە ڕوكەش جوانبێتو دور لە دینو ڕەوشتو خراپ بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ مەدحو ستایشی ئەوانەی كردوە كە خاوەن دین هەڵدەبژێرن، فەرموویەتی: « أَلاَ أُخْبِرُكَ بِخَيْرِ مَا يَكْنِزُهُ الْمَرْءُ الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ » أَخرَجَهُ الحاكِم[١٧].

واتە: ئایە هەواڵتان نەدەمێ بە باشترین سامانو گەنجینەیەك كە كەسێك دەستی بكەوێت: ئافرەتی چاكە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: « تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ، فَإِنَّ الْعُرُقَ دَسَّاسَ »[١٨].

واتە: ئافرەتی باش هەڵبژێرن بۆ ئاوەكانتان، لەبەرئەوەی منداڵ دەچێتەوە سەر كەسو كاری ئافرەتەكە.

---

(١٧) حديثٌ حسنٌ: صحيح ابن ماجة، رقم الحديث: (١٦٠٢).

(١٨) أخرجه ابن ماجة (١٩٦٨) مِنْ حَديثِ عَائِشَةَ رضي الله عنها، بِلَفْظٍ: « تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ، وَانْكِحُوا الْأَكْفَاءَ، وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِمْ ». [حديثٌ حسنٌ: صحيح ابن ماجة، رقم الحديث: (١٦٠٢)]. **واتە: شوێن هەڵبژێرن بۆ ئاوەكانتان، خوازبێنی هاوتای خۆتان بكەنو هاوتای خۆشتان بهێنن.**

وَوَرَدَ بِلَفْظٍ: « وانظر في أي نصاب تضع ولدك، فإن العرق دساس » أخرجه القضاعي في "مسند الشهاب" (٣٧٠/١) (٦٣٨) مِنْ حديث ابْنِ عُمَرٍ رضي الله عنهما. [ضَعيفٌ جداً: سلسلة الأحاديث الضعيف: (٣٨/٥) (٢٠٢٣)].

**ئەو ڕیوایەتەی نوسەر هێناویێتی لەسەرەوە بەو شێوەیە نەهاتووە. وە ئەم ڕیوایەتەی تریش هاتووە:** « **تزوجوا في الحِجر الصالح فإن العرق دساس** » حديث موضوع: (سلسلة الأحاديث الضعيفة: (٤١١/٧) رقم الحديث: (٣٤٠١). **-وەرگێڕ-**.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ، وَانْكِحُوا الْأَكْفَاءَ، وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِمْ »[١٩]. واتە: شوێن هەڵبژێرن بۆ ئاوەکانتان، وە خوازبێنی هاوتای خۆتان بکەنو هاوتای خۆشتان بهێنن.

وە ئەمە مافی منداڵە لەسەر باوك کە ئەویش هەڵبژاردنی دایکێکی باشە.

پیاوێك هات بۆلای ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) گلەیی لە منداڵەکەی کرد لەسەر ئەوەی حەقەو مافی نادات، کوڕەکەی ئامادەبو، ئاگاداری کردەوە لەسەر ئازاردانو سەرپێچی کردنی باوك، کوڕەکە وتی: « ئایە منداڵ هیچ مافێکی نیە لەسەر باوك؟ » فەرموی: « بەڵێ »، وتی: « ئەو مافانە چییە؟ » عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموی: « دایکێکی باشی بۆ هەڵبژێرێت، ناوێکی باشی بنێت، وە قورئانی فێر بکات ». کوڕەکە وتی: باوکم هیچ یەکێك لەمانەی نەکردوە. دایکم ئافرەتێکی کۆیلەی ئاگر پەرستە، وە ناومی ناوە "جُعَلْ – قالۆنچە" وە یەك پیت قورئانیشی فێر نەکردوم »، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ڕوی کردە پیاوەکەو پێی فەرمو: « هاتوی گلەیی دەکەیتو مافی کوڕەکەت نەداوە وە مافیت نەداوە پێش ئەوەی مافت نەدات »[٢٠].

---

(١٩) حديث حسن: صحيح وضعيف سنن ابن ماجة، رقم الحديث: (١٩٦٨).

(٢٠) ئەم چیرۆکە ئەگەرچی زۆر بەربڵاوەو باس دەکرێت، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی ڕاستی نییە لە کتێبی زانایان.... https://www.ahlalhdeeth.com/vb/showthread.php?t=260449 . –وەرگێڕ–.

أبو الأَسوَد الدُّؤَلِي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموی: بە منداڵەكانی: " من چاكەم لەگەڵ ئێوەدا كردوە بە منداڵیو بە گەورەییو پێش ئەوەی لە دایكیش ببن" وتیان: "چۆن چاكەت لەگەڵ ئێمەدا كردوە پێش ئەوەی لە دایك ببین؟" فەرمووی: "لەو دایكانەم بۆ هەڵبژاردون كە بەهۆی ئەوانەوە جنێوتان پێ نادرێت".

وە (الْرِّيَّاشِيُّ) ئەم باسەی كردووە بە شیعر:

فَأَوَّلُ إِحْسَانِي إِلَيْكُمْ تَخَيُّرِي ... لِمَاجِدَةِ الْأَعْرَاقِ بَادٍ عَفَافُهَا [٢١].

واتە: یەكەم چاكەم بۆ ئێوە هەڵمبژاردوە ... لە ئافرەتی داوێنپاكو چاك

## ئافرەتیش هەوڵبدات بۆ پیاوێكی چاك:

هەروەكو چۆن كوڕ دەگەڕێت بە دوای ئافرەتێكی چاك بەهەمان شێوە ئافرەتیش دەبێت هەڵبژێرێت كوڕێكی چاك.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « **إِذَا أَتَاكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ** »[٢٢].

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێك هاتە داوای كچەكەتان لە دینو ئەخلاقی ڕازیبوون

---

([٢١]) أدب الدنيا والدين للماوردي رحمه الله، لاپەڕە: (١٥٨).

([٢٢]) حديث حسن: أخرجهُ التِّرمِذي (١٠٨٥) مِنْ حديث أَبِي حَاتِمٍ المزَنِيِّ رضي الله عنه، وقالَ: حديثٌ حسنٌ غريبٌ. أَبُو حَاتِمٍ الْمُزَنِيِّ لَهُ صُحبة ولا تعرِفُ لهُ عنِ النَّبي ﷺ غيرَ هذا الحديث. مشكاة المصابيح، رقم الحديث: (٣٠٩٠).

بیدەنێ، ئەگەر وانەکەن ئەوا فیتنەو ئاشوبی فراوان لەسەر زەوی بەرپا دەبێت.

بۆیە وا دەبینین ئەساس‌و بناغەی پتەوو بەهێز بۆ هەڵبژاردن لە نێوان ژن‌و پیاو دین‌و ئەخلاقە، ئەوە بەدەست دێت بۆ پەروەردەکردنی ڕاست بۆ منداڵ.

وە سوننەتە کە شەوی یەکەم ژنی گواستەوە پیاوەکە دەست بخاتە ناوچەوانی‌و ئەم دوعایە بخوێنێت: « اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا، وَخَيْرِ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ »[٢٣].

واتە: خوایە داوای چاکەی ئەمەت لێ دەکەم وە چاکەی ئەخلاقی‌و خوڕەوشتی، وە پەنات پێدەگرم لە شەڕو خراپەی‌و شەڕو خراپەی خوڕەوشتی ناشرینی.

وە پاشان دوو ڕکات نوێژ بەیەکەوە دەکەن.

---

(٢٣) أخرجه الحاكم في "المستدرك" (٢/٢٠٢) (٢٧٥٧) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَمْرٍو ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « إِذَا أَفَادَ أَحَدُكُمُ الْجَارِيَةَ أَوِ الْمَرْأَةَ أَوِ الدَّابَّةَ ، فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا ، وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ ، وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا ، وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ » وصححه ووافقه الذهبي. وأخرجه أبو داود (٢١٦٠)، وابن ماجة (١٩١٨) و (٢٢٥٢)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧/١٤٨) (١٣٨٣٨) و (١٣٨٣٩). [حديث حسن: صحيح ابنُ ماجة، رقمُ الحديث: (١٥٥٧)].

واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە خزمەتکارێکی هێنا یان ژنی هێنا یان وڵاخێکی دەست کەوت با دەست بگرێت بە ناوچەوانی‌و دوعای بەرەکەت‌و پیرۆزی بۆ بکات: دوعاکە .........

## ٣- بِسْمِ الله بكات پێش چوونە لای خێزانی:

وە لە هۆكارەكان كە یارمەتیدەرە بۆ گەیاندن لەسەر بوونی منداڵی چاك دوعاكردن پێش (الْجِمَاع – سەرجێیی و كاری شەرعی لەگەڵ خێزان–)

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « **لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ**[٢٤] **قَالَ: بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ لَمْ يَضُرُّهُ** »[٢٥] مُتَّفَقٌ عَلَيهِ. وفي رواية الْبُخاريُّ: « **لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا** »[٢٦].

---

(٢٤) ڕونكردنەوەیەك لەسەر زیكری چوونەلای خێزان:

قال الشيخ ابن عثيمين رحمه الله: وهذا الحديث يدل على أنه لا يكره للإنسان ذكر الله إذا كان قد كشف عورته، لأنه لا يمكن أن يجامع إلا بذلك وهو سيقول اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا فهو سوف يذكر الله عز وجل ويدعوه، وقد يقول قائل: ألا يمكن أن يكون هذا قبل أن يتهيأ للجماع؟ بمعنى إذا عزم على الجماع قبل أن يتهيأ يقول اللهم جنبنا الشيطان إلى آخره، فيقال نعم هذا ممكن لكن الإحتمال الأول أقرب أنه عندما يتهيأ تهيؤًا كاملا، وقوله عليه الصلاة والسلام بسم الله جار ومجرور متعلق بأيش؟ بفعل محذوف يقدر مناسبا للفعل فيكون التقدير هنا باسم الله أجامع أو أطأ، اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا.

شێخ ابن عثيمين (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی:

دروستە ئینسان زیكری خوا بكات و پۆشاكی لەبەردا نەبێت، لەبەرئەوەی ناكرێت جیماع بكات ئیللا بەو شێوازە نەبێت، وە لە دوای ئەوە دەڵێن: "اللَّهُمَّ جَنِّبْنَاالشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا".

لەوانەیە كەسێك پرسیار بكات و بڵێت: ئایە نابێت پێش ئەوەی خۆمان ئامادە بكەین بۆ جیماع ئەو دوعایە بخوێنین؟ واتە ئەگەر كەسێك ویستی جیماع بكات ئەو دوعایە بخوێنێت پێش ئەوەی پۆشاكەكەی دابنێت و بڵێت: "اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ " تا كۆتایی.

پێی دەوترێت: بەڵێ ئەم ئیحتیمالەش دەبێت، بەڵام ئیحتیمالی یەكەم بەهێزترە، كاتێك خۆی ئامادەكردبوو ئەوە خۆ ئامادەكردنێكی تەواوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمویەتی: "بِسْمِ

واتە: لە ابن عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێك لە ئێوە بچێتە لای خێزانەكەی بڵێت: بەناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دوربخەرەوە وە دوری بخەرەوە لەو منداڵەشی كە پێمان دەبەخشی، ئەگەر منداڵێك دروست ببێت لە نێوانیاندا ئەوا زیانی لێ ناكەوێت.

لە ڕیوایەتی ئیمامی بووخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێت): هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.

## زانایان ڕاوبۆچونی جیاوازیان هەیە لەسەر دیاریكردنی زیانەكە (هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت):

١- شەیتان زاڵ نابێت بەسەریدا بە بەرەكەتی ئەوەی ناو خوا هێنراوە.

٢- شەیتان توشی پەركەم و گەشكەی ناكات.

٣- شەیتان زیانی پێناگەیەنێت لە لاشەو جەستەی.

٤- بەڵام ابنُ دَقیق العید (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: لەوانەیە واتای ئەوەبێت زیانی پێنەگەیەنێت لە دینەكەی. وە داودی (ڕەحمەتی خوای

---

اللهِ" ئەوە (جار و مجرور) واتە: بەدوای یەكدا دێت، پەیوەستە بە چییەوە؟ پەیوەستە بە كارێكی محذوف كە ئەویش جیماع كردنە واتە بە ناوی تۆ خوایە جیماع دەكەم. ... (شرح صحیح مسلم: كتاب النكاح والرضاع والطلاق واللعان والعتق). -وەرگێڕ-

([25]) أخرجه البُخاري (١٤١)، ومسلم (١٤٣٤) (١١٦)، وأبو داود (٢١٦١)، والترمذي (١٠٩٢)، وابن ماجة (١٩١٩).

([26]) أخرجه البُخاري (٥١٦٥) و (٦٣٨٨) و(٧٣٩٦)، ومسلم (١٤٣٤) (١١٦)، وأبو داود (٢١٦١).

لێبێت) دەفەرموویت: (لَمْ يَضُرُّهُ) واتە: توشی فیتنە نابێت لە دینەكەی توشی كوفری بكات، نەك بە واتای ئەوە بێت كە هیچ تاوانێك ئەنجام نادات.

مەبەست پێی ئەوەیە خوای گەورە ئەو منداڵە دەپارێزێت لە دەست لێدانی شەیتانو ئازاردانی بەهۆی بەرەكەتو پیرۆزی ئەو زیكرە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنماییمانی كردووە بۆی.

## وە لەو هۆكارانەی تر كە پەیوەندی هەیە بە ساڵح بوونو چاكبوونی منداڵو پەروەردەكردنیان:

### ٤- ئاگاداربوونی دایك لە كاتی سكپڕیدا:

ئەویش بەوەی خواردنێك نەخوات كە زیان بە كۆرپەلەكەی بگەیەنێت یان ببێتە هۆی شێواندنی، وەكو:

١- حەبو دەرمانو تیشك. (بەبێ ئیزنی دكتۆر).

٢- ئیشی قورس.

٣- جگەرەكێشان[٢٧] لە لایەن دایك یان هاوسەرەوە.

٤- ئەوەی دەبێتە هۆی بێهۆشبوونو سەرخۆش بوون [٢٨] (منداڵێك دەردەچێت كە ئالودە بێت بە ماددەی بێهۆشی؛ چونكە كۆرپەلە ئەوە دەخوات كە دایكەكە دەیخوات).

---

[٢٧] نێرگیلەش دەگرێتەوە. -وەرگێڕ-.

[٢٨] وەك: عارەقو تلیاكو حەشیشەو .... -وەرگێڕ-.

## موژدەدان لە كاتی لە دایكبوونی منداڵ:

كاتێك خوای گەورە منداڵێكی بەخشی بە موسڵمانێك سوننەتە كە موژدەی بدرێتێ، لەكاتی لە دایكبوونی، وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ ﴾ [مريم: ٧].

واتە: خوای گەورە وەڵامی دایەوە ئەی زەكەریا ﷺ ئێمە موژدەت پێ دەدەین بە منالێك كە ناوی لێ ئەنێین یەحیا.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾ [الصافات: ١٠١].

واتە: منداڵێكمان پێی بەخشی كە ئیسماعیل ﷺ بوو كە دواتر منداڵێكی حەلیمو هێمنو ئارامو لەسەرخۆ بوو.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ [الصافات: ١١٢].

واتە: وە لە دوای ئیسماعیل ﷺ موژدەمان پێدا بە كوڕێكی تر كە ناوی ئیسحاق ﷺ بووە، وە لە داهاتوودا دەبێت بە پێغەمبەرێك لە پیاوچاكان.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ ٱسۡمُهُ ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ وَجِيهٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ [آل عمران: ٤٥].

واتە: ﴿إِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ﴾ كاتێك كە مەلائیكەتەكان وتیان: ئەی مەریەم خوای گەورە مژدەت ئەداتێ بە وشەیەك كە

وشەكە ئەوەبو خـوای گـەورە فـەرمووی: (كُنْ) عیـسی ﷺ دروسـتبە یەكسەر ئـەویش دروسـت بـوو ﴿مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ﴾ كـە ئـەو وشـەیەش كـە عیـسای لـێ دروست ئەبێ نـاوی مەسـیحە لەبـەر ئـەوەی دەسـتی بەسـەر هـەر نەخۆشـیەكدا بهێنایە ئیللا بە ئیزنی خوای گەورە چاك ئەبو بۆیە پێی وتراوە: مەسـیح، یـاخود لەبەر زۆر گەڕان و سەفەر كردنی ﴿عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ عیسای كـوڕی مەریـەم ﷺ لەبـەر ئـەوەی بـەبێ بـاوك لـە دایـك بـووە درایـە پـاڵ دایكـی ﴿وَجِيهًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ لە دونیاو قیامەتیشدا خاوەن ڕێزو پلەو پایەو ناوبانگە.

## سـوجدەی شـوكر بـردن كاتێـك هـەواڵت پێـدەگات كـە منـداڵتان بووە:

كاتێـك ئـەو نیعمەتـەت دەسـت دەكـەوێت سـوننەتە بـۆ موسـڵمان كـە سوجدەی شوكر بەرێت بۆ خوای گـەورە. وە سـوجدەی شـوكر ڕێگەپێـدراوە، بەڵكو جەخت كراوەتـەوە لەسـەر سـوننەتێتی كـە كاتێـك نیعمـەتێكت دەسـت دەكـەوێت، یـان نارەحـەتیو بەڵایـەكت لەسـەر لادەچـێت. ئـەویش یـەك سوجدەیەكە دەیبەیت، وەكو سوجدەی قورئان خوێندن.

"كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَاءَهُ أَمْرٌ سُرُورًا أَوْ يُسَرُّ بِهِ خَرَّ سَاجِدًا شَاكِرًا لِلَّهِ تَعَالَى"[٢٩].

---

(٢٩) حديث حسن: أخرجه أبو داود (٢٧٧٤)، وابنُ ماجة (١٣٩٤)، والترمذيُّ (١٥٧٨) مِنْ حديث أَبِي بَكْرَةَ ﷺ. وانظر "زاد المعاد" لابن القيم ﷺ (٣٤٨/١-٣٥٠) فصل [سجود الشكر]. مشكاة المصابيح (١٤٩٤).

❁ كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵێكی پێبگەیشتایە دڵخۆشی بكردایە یان كارێكی بۆ ئاسان ببووایە دەست بەجێ سوجدەی شوكری بۆ خوا دەبرد.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: « إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي وَشَفَعْتُ لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِي الثُّلُثَ الْآخِرَ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا »[٣٠].

واتە: من داوام لە پەروەردگارم كردو شەفاعەتم كرد بۆ ئوممەتەكەم (كە خوای گەورە لە ئوممەتەكەم خۆش بێت لە تاوانەكانیان) سێ بەشی یەكەمی پێ بەخشیم (ئەوانەی پێشەنگ بوون) منیش سوجدەم بۆ پەروەردگارم بردو سوپاسم كرد لەسەر ئەو لێخۆشبوونەی، پاشان سەرم بەرزكردەوەو داوام لە پەروەردگارم كرد بۆ ئوممەتەكەم سێ بەشی تری پێ بەخشیم (كە ئەوانەن كە مام ناوەندنو زیاتر فەرزەكان جێ بەجێ دەكەن) منیش سوجدەم بۆ پەروەردگارم بردو سوپاسم كرد لەسەر ئەو لێخۆشبوونەی، پاشان سەرم بەرزكردەوەو داوام لە پەروەردگارم كرد بۆ ئوممەتەكەم سێ بەشی تری پێ بەخشیم (ئەوانەن كە سەرپێچی كارنو تاوان ئەنجام دەدەن دەرحەق بە نەفسی خۆیان) منیش سوجدەم بۆ پەروەردگارم بردو سوپاسم كرد لەسەر ئەو لێخۆشبوونەی.

---

(٣٠) حديثٌ ضعيف: أخرجهُ أبو داود (٣٧٧٥). [مشكاةُ المصابيح، رقمُ الحديث: (١٤٩٦)، وسلسلة الأحاديث الضعيفة: (٢١٧/٧) رقمُ الحديث: (٣٢٣٠)].

وە ئیمامی أبو بكر (ڕەزای خوای لێبێت) كاتێك كە هەواڵی پێگەیشت یەمامە ئازادكرا سوجدەی شوكری برد بۆ خوای گەورە[٣١].

وە ئیمامی كەعبی كوڕی مالك (ڕەزای خوای لێبێت) سوجدەی شوكری برد كاتێك كە هەواڵی پێگەیشت خوای گەورە تەوبەكەی لێوەرگرتوە.[٣٢]

## ٥- فەزڵ‌و گەورەیی پەروەردەكردنی كچ لە ئیسلامدا:

بە داخێكی زۆر گەورەوە كە هەندێك لە خەڵكی كاتێك كە هەواڵیان پێدەگات كچیان بووە توڕە دەبن بەوە، وە ئەم كارە لە ئەخلاق‌و خوڕەوشتی جاهیل‌و موشریكەكانی پێش ئیسلامە كە خوای گەورە زەم‌و سەرزەنشتیان دەكات لەسەر ئەو كارەیان‌و دەفەرموویێت: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٞ ٥٨ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓۚ أَيُمۡسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمۡ يَدُسُّهُۥ فِي ٱلتُّرَابِۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴾ [النحل: ٥٨ – ٥٩].

واتە: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَى﴾ وە كاتێك یەكێك لەوان مژدەی پێ بدرایە كە خێزانەكەت منداڵی بووەو كچی بووە ﴿ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا﴾ بە بەردەوامی‌و بە درێژایی ڕۆژ ڕەنگی ڕەش هەڵئەگەڕا لە خەفەتدا ﴿وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨)﴾ وە غەم و خەفەتی خۆی ئەخواردەوەو دەرینەئەبڕی كە چەندێك

---

[٣١] أخرجهُ البَيهَقيُّ في "السنن الكبرى" (٢/٣٧١) (٣٩٤٠).

[٣٢] أخرجه البخاري (٤٤١٨)، ومسلم (٢٧٦٩).

خەفەتبار ئەبو ﴿يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ﴾ لەناو قەومەكەیدا لەناو خەڵكیدا خۆی ئەشاردەوەو شەرمی ئەكرد لە خراپی ئەو موژدەیەی كە پێی دراوە كە تووشی چ عەیب و عارێك بووە كە كچی بووە ﴿أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ﴾ نەی ئەزانی ئایا ئەبێت ئەم كچە بهێڵێتەوەو دواتر ببێتە هۆی سەرشۆڕی ئەو كە لای ئەوان مانەوەی كچ و بەشودانی سەرشۆڕی بووەو كچەكەیشیان سەرشۆڕ كردوەو بایەخ و میراتیان پێ نەداوە ﴿أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ﴾ یاخود بیشارێتەوە لەناو خۆڵداو زیندەبەچاڵی بكات وەكو هەندێك لە عەرەب وایان ئەكرد ﴿أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ بەڕاستی خراپترین بڕیار بوو كە ئەیاندا سەبارەت بە كچانیان.

وە ئینسان نازانێت چی خێرو چاكەی تێدایە بۆی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ [النساء: ١٩].

واتە: وە ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك ڕقتان لە خێزانەكانتان بوو بەبێ ئەوەی فاحیشەو زیناو خراپەكاری كردبێ ئەوە لەوانەیە ئێوە شتێكتان لەلا ناخۆش بێو پێتان ناخۆش بێ بەڵام خوای گەورە خێرێكی زۆری تێ كردبێ ئێوە نازانن لەوانەیە منالّی باشی ببێ بۆیە ئارام بگرن لەسەریان.

بەوچەشنەو شێوازە كچ دەبێتە خێرو چاكەیەكی زۆر بۆ كەسێك لە دونیاو قیامەت. وە بەسە بۆ خراپی ئەو كارەیان كە شتێكیان پێ ناخۆشە كە خوای گەورە پێی ڕازییە بۆیان.

وە هەندێك لە خەڵكی هەڵسو كەوت لەگەڵ ئەو خێزانە بێدەسەڵاتەی

دەکات بە شێوازێکی خراپ لەبەرئەوەی منداڵی بووەو کچە، وە لەوانەیە پشتی تێبکاتو قسەی لەگەڵ نەکات یان تەڵاقی بدات یان خراپ بێت لەگەڵیدا یان عەیبو عاری لێبگریت.

ئایە لە سزای خوای گەورە ناترسن لەسەر ئەو زوڵمەی دەیکات.

بووەستەو عەقڵت بکە کار: ئایە ئەوەی بووەیەتی بە دەستی خۆیەتی یان بە دەستی دروستکراوەکەیەتی، ئایە نازانیت ڕقلێبوونو گلەییکردنتو ڕازی نەبوونت ڕەخنە گرتن نییە لە زاتی خوای گەورە.

پاشان بزانە خوای گەورە کچی داوە بە کەسێك لە تۆ بەڕێزترە لەلای خوای گەورە، وەکو: پێغەمبەر لوط، وە پێغەمبەر شوعەیب (سەلامی خوایان لێبێت)، وە پێغەمبەری خواش ﷺ کوڕی نەژیاو بە منداڵی مردن، وە خوای گەورە بەرەکەتی خستە فاتیمەی کچیو منداڵەکانی (ڕەزای خوایان لێبێت).

## لەو قسەو باسە خۆشانەی دەگێردرێتەوە:

پیاوێك لە عەرەب نازناوەکەی (أَبي حَمْزَة الضبي) بوو، ژنی هێناو هیوای ئەوەی بوو کە کوڕێکی لێببێت، بەڵام کچێکی لێبوو چادری ژنەکەی بەجێهێشت لە زۆری ڕق لێبوونی لەو منداڵە کچە، بۆخۆی لە شوێنێکی تر دەمایەوە، ڕۆژێك دای بە بەردەم ئەو چادرەی ئەوانی تێدابوو بینیتی ژنەکەی لەگەڵ منداڵەکەی یاری دەکاتو دەڵێت:

مَا لِأَبِي حَمزةَ لَا يَأتِينا ... يَظَلُّ فِي البَيتِ الَّذي يَلِينَا

غَضْبانَ أَن لا نَلِدَ البَنِينا ... تَا للهِ مَا ذَلِكَ فِي أَيدِينَا

وَإِنَّما نَأخُذُ مَا أُعْطِينا ... وَنَحْنُ كَالأَرْضِ لِزَارِعِينَا

نُنْبِتُ مَا قَدْ زَرَعُوْهُ فِينَا ...[٣٣]

ئەوە بۆ ئەبو حەمزە نایات بۆ لامان لەو ماڵە دەمێنێتەوە کە لێمان نزیکە

تورەیە لەبەرئەوەی کوڕمان نەبوو سوێند بەخوا ئەم شتە لە دەست ئێمە نییە

ئەوە وەردەگرین کە پێمان دەدرێت ئێمە وەکو زەوی واین کە تۆوی تێدەکرێت

ئەوە بەرهەم دێنین کە تیامان چێنراوە

کاتێك کە أبو حمزە گوێبستی ئەم چەند پارچە شیعرە دەبێت سۆزی باوکایەتی دەیگرێت‌و دەچێتە ژورەوە، سەری ژن‌و منداڵەکەی ماچ دەکات.

## ئیسلام پەروەردەکردنی کچی داناوە بە هۆکارێك بۆ چونە بەهەشت:

❁ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ حَدَّثَهُمْ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ، يُؤْوِيهِنَّ، ويَكْفِيهِنَّ، وَيَرْحَمُهُنَّ، فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَعْضِ الْقَوْمِ: وَثِنْتَيْنِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « وَثِنْتَيْنِ »[٣٤].

واتە: جابری کوڕی عبداللە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوەو

---

(٣٣) البيان والتبيين للجاحظ (١/١٠٨).

(٣٤) حديثٌ حسن: أخرجهُ أحمد في "المسند" (٢٢/١٥٠) (١٤٢٤٧)، والبُخاري في "الأدب المفرد" (٧٨). صحيح الأدبُ المُفرد: رقمُ الحديث: (٥٧).

دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەركەسێك سێ كچی هەبێت پەنایان بداتو جێگەیان دابین بكاتو بێ پێویستیان بكاتو ڕەحمیان پێ بكات ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێتو گەڕانەوەی نییە » پیاوێك كە لەوێ دانیشتبوو فەرمووی: دوو كچیش بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: « دوو كچیش بێت ».

❁ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ" وَضَمَّ أَصَابِعَه »[٣٥]. وَفي لَفظٍ: « دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ الجَنَّةَ كَهَاتَيْنِ"، وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السبَّابَةِ والَّتِي تَلِيها »[٣٦].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالك (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « هەركەسێك دوو كچ بەخێو بكات تا پێدەگەنو بالغ دەبن[٣٧] لە ڕۆژی دواییدا منو ئەو كەسە وەكو ئەو دوو پەنجەیە واین پێكەوە ». لە ڕیوایەتێكی تردا: « منو ئەو كەسە وەكو ئەو دوو پەنجەیە دەچینە بەهەشتەوە"، ئاماژەی بە پەنجەی شایتمانو ئەوەی تەنیشتی كرد پەنجەی ناوەڕاست ».

---

(٣٥) أخرجه مسلم: (٢٦٣١)، والتِّرمذيُّ (١٩١٥).

(٣٦) حديث صحيح: أخرجه البخاري في "الأدب المفرد" (٨٩٤)، والحاكم في "المستدرك" (١٩٦/٤) (٧٣٥٠) وصححه ووافقه الذهبي. سلسلة الأحاديث الصحيحة: (١٠٤٩/٢) رقم الحديث: (٦٥٦٥)، و صحيح الترغيب والترهيب، رقم الحديث: (١٩٧٠).

(٣٧) یان شو دەكەنو دەگەنە لای مێردی خۆیان. (مِرقاةُ المفاتيح شرح مشكاة المصابيح: (٣١٠١/٧) رقمُ الحديث: (٤٩٥٠) –وەرگێڕ–.

## فەزڵو گەورەیی پەروەردەکردنی یەك كچ:

❁ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ عَلَيْهَا - يَعْنِي الذُّكُورَ - أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ»[٣٨].

واتە: لە ابن عباسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەت: هەرکەسێك منداڵی کچی هەبێت بە زیندوویی زینـدە بەچاڵی نەکات (وەك عادەتی سەردەمی جاهیلی)، وە ئیهانـەو سـوکایەتی پـێ نـەکات (بەهۆکاری زەلیلیو سەرشۆڕیو عەیبەی نـەزانێت بـۆ داهـاتوو کـە بـە شـووی دەدات)، وە منداڵی کوڕی پێ پەسـەندترو چـاکتر نـەبێت، ئـەوا خـوای گـەورە دەیکاتە بەهەشتەوە.

لە فەزڵو گەورەیی هەستان بە پەروەردەکردنی دوو کچ یان دوو خوشـك،

❁ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « مَنْ عَالَ ابْنَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا أَوْ أُخْتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا حَتَّى يَبِنَّ أَوْ يَمُوتُ عَنْهُنَّ كُنْتُ أَنَا وَهُوَ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ - وَأَشَارَ بِأُصْبَعِهِ الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِيهَا »[٣٩].

---

([٣٨]) **حديثٌ ضعيفٌ: أخرجهُ أبو داود (٥١٤٦)، وأحمد في "المسند" (٣/٤٢٦) (١٩٥٧).** [صحيح وضعيف سنن أبي داود، رقم الحديث: (٥١٤٦)، وضعيف الجامع الصغير وزيادته، رقم الحديث: (٥٨٠٧)].

([٣٩]) **أخرجه أحمد (١٩/٤٨٠-٤٨١)(١٢٤٩٨)، وابن حبان في "صحيحه" (٢/١٩١٩) (٤٤٧) واللَّفظُ له.** التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان، رقم الحديث: (٤٤٨). صحيح الترغيب والترهيب، رقم الحديث: (١٩٧٠)].

واتــە: لــە ئەنەســی كــوڕی مالــك (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەفــەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوو كچ یان سێ كچ یـان دوو خوشك یان سێ خوشك بەخێوبكات تا (شو دەكـەن)[٤٠] یـان لای ئـەو دەمـرن، ئەوا منو ئەو كەسە وەكو ئەو دوو پەنجەیە دەچینە بەهەشتەوە– ئاماژەی بە پەنجەی ناوەڕاستو ئەوەی تە نیشتی كرد.

يَبِنَّ: واتە هەركەسێكیان بێ پێویست بكات.

❁ ابنُ بطَّال (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێویستە لەسەر هەر كەسێك كە ئەم فەرمودەیە دەبیستێت كاری پێبكات تا هاوڕێی پێغەمبەر ﷺ بێت لە بەهەشتدا، وە هیچ پلەو پایەیەك نییە بە ئەندازەی ئـەوە بـەرزبێت لـە بەهەشتدا.[٤١]

## ٦- بانگدان بە گوێی منداڵی تازە لە دایكبو:

وە لەو سوننەتانەی تر[٤٢] كە پێویستە لەسەر موسـڵمان ڕەچـاوی بكـاتو كاری پێبكات بانگدانە بە گوێی منداڵی تازە لە دایكبو.

---

(٤٠) عون المعبود (٩/٢٤٣٠). –وەرگێر–

(٤١) فتح الباري (١٠/٥٣٦) (٦٠٠٥). باب فضل من يعول يتميا.

ئیمامی ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەو وتەیەی ابن بطال (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە كاتی شەرحكردنی ئەم فەرموودەیە هێناوە (٦٠٠٥) ئەوەیە: « أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ هَكَذَا » دەفەرموێت: ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانو ئەوەی تەنیشتی یەوە كرد –پەنجە گەورە– وە ئەمە لەسەر پەروەردەكردنی كچانە جێبەجێ دەبێت چۆن جێبەجێ دەبێت بەسەر بەخێوكردنی هەتیو.

(٤٢) ئەو فەرموودانەی هاتووە دەربارەی بانگدان بە گوێی منداڵدا (**ضعيف**)ەو كاری پێناكرێت.

**عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: « رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ حِينَ وَلَدَتْهُ فَاطِمَةُ بِالصَّلَاةِ »[٤٣].**

**واتە: لە عوبەیدوڵڵا کوڕی ئەبی رافعەوە، لە باوکییەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرمویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ: بینی بانگیدا بە گوێی حەسەنی کوڕی عەلی کاتێك فاطمة منداڵەکەی بو.**

---

**ئەوەی جێگیربووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەکو عائیشە دایکی باوەڕداران (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە، کاتێك منداڵێکیان بهێنایە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ دەکرد بە بەرەکەتو مەلاشوی شیرین دەکرد.** أنَّه كان يُؤْتَى إليه بالصبيان فيَدْعُو لهم بالبَرَكة ويُحَنِّكهم. انظر: الحديثَ الذي أخرجه مسلمٌ في «الطهارة» (٢٨٦)، وأبو داود في «الأدب» بابٌ في الصبيِّ يُولَدُ فيُؤذَّنُ في أُذُنه (٥١٠٦).

**وە ئەم فەرمودەیەیش هاتووە: " من ولد له مولود فأذن في أذنه اليمنى وأقام في أذنه اليسرى لم تضره أم الصبيان ".**

موضوع. سلسلة الأحاديث الضعيفة، رقم: (٣٢١).

رواه أبو يعلى في " مسنده " (٤ / ١٦٠٢) وعنه ابن السني في " عمل اليوم والليلة " (٢٠٠ / ٦١٧) وكذا ابن عساكر (١٦ / ١٨٢ / ٢) **من طريق أبي يعلى وابن بشران** في " الأمالي " (٨٨ / ١) وأبو طاهر القرشي في " حديث ابن مروان الأنصاري وغيره " (٢ / ١) من طريق يحيى بن العلاء الرازي عن مروان بن سليمان عن طلحة بن عبيد الله العقيلي عن الحسين بن علي مرفوعا.

قلت (الألباني –رحمه الله–): وهذا سند موضوع، يحيى بن العلاء ومروان بن سالم يضعان الحديث. **–وەرگێڕ–**

([٤٣]) حديث ضعيف: أخرجه أبو داود (٥١٠٥)، والترمذي (١٥١٤)، وأحمد في "المسند" (٣٩/٢٩٧) ((٢٣٨٦٩). [سلسلة الأحاديث الضعيفة: رقم الحديث: (٣٢١)، وتَراجُعات الشيخ الألباني ﵀ (١/٧٧)].

❁ ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: هەندێك لە هاوەڵانمان دەفەرمون: سوننەتە لە گوێی ڕاستی بانگ بدرێت، وە گوێی چەپی قامەت بكرێت.[٤٤]

❁ ئیمامی ابن القيم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: نهێنی باگدان واللهُ أَعْلَم: لەبەرئەوەبێت یەكەم شت كە ئینسان دەیبیستێت ئەو وشانە بێت كە گەورەییو توانای خوای گەورە لەخۆدەگرێت، وە شایەتمان كە یەكەم شتە پێی دێتە ناو ئیسلامەوە، وەكو تەلقین دروشمو نیشانەی ئیسلامە كە دێتە دونیاوە بۆ ناو ئیسلام، وەكو چۆن تەلقین دەكرێت بە وشەی تەوحیدو یەكتاپەرستی كاتێك دونیا جێدەهێڵێت، بەبێ زۆر لێكردن پاشماوەی ئەو بانگدانە دەمێنێتو كاریگەری لەسەر دەبێت، ئەگەرچی هەندێك سودی تر هەبێت هەستی پێنەكات، ئەویش ئەوەیە هەڵهاتنی شەیتان لە كاتی وتنی بانگ.[٤٥]

---

([٤٤]) المجموع شرح المُهَذَّب (٨/ ٤٤٢).

([٤٥]) تحفة المودود بأحكام المولود. لاپەڕە: (٣١). مكتبة دار البيان – دمشق. الطبعة: الأولى.

## ٧- وە لە سوننەتەکانی تر کە پێویستە لەسەر موسڵمان کە کردەوەی پێبکەن سوننەتی (التحنيك) ئەوەیە کە بە شیرینییەك کە خۆت بیجوی و مەلاشوی منداڵەکەی پێ شیرین بکەیت.[٤٦]

❁ عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: وُلِدَ لِي غُلاَمٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ «فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ »[٤٧].

---

(٤٦) **ڕونکردنەوەیەك لەسەر شیرین کردنی مەلاشوی منداڵ:**

قال الشيخ عبدالمحسن العباد (حفظه الله): لا يذهب إلى أحد ليحنك من أجل التبرك به؛ وإنما الرجل يحنك ولده، والمرأة تحنك ولدها، ولكن لا يذهب إلى أحد من أجل تحصيل بركة ريقه؛ لأن هذا خاص برسول الله – صلى الله عليه وسلم – ولأنهم لم يكونوا بعد ذلك يذهبون إلى أبي بكر، أو عمر، أو عثمان، أو علي، وهم خيرُ الناس بعد رسول الله – صلى الله عليه وسلم – فدل صنيع الصحابة – رضي الله عنهم وأرضاهم – على أن هذا يخصُّه، ولا يكون لغيره من الناس، كما كانوا يتبرّكون بشعره إذا حلق. وأما قول الإمام النووي – عليه رحمة الله –: "فيه استحباب التبرك بأهل الفضل"، فغير صحيح؛ لأن التبرك بشخص النبي – صلى الله عليه وسلم – هو الذي ثبت، وأما غيره، فلا.

**شێخ عبدالمحسن العباد (خوای گەورە بیپارێزێت) دەفەرموێت: کەس منداڵەکەی خۆی نەبات بۆلای کەس بۆ ئەوەی کە (تحنيك) بکات لە بەر بەرەکەت و پیرۆزی ئەو کەسە، بەڵکو پیاو مەلاشوی منداڵەکەی خۆی شیرین دەکات، وە ئافرەتیش مەلاشوی منداڵەکەی خۆی شیرین دەکات، بەڵام کەس منداڵەکەی خۆی نەبات بۆلای کەس لەبەر بەرەکەتی لیکەکەی، لەبەرئەوەی ئەوە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خوا ﷺ وە لە دوای وەفاتی کەس لە هاوەڵان نەچونە بۆلای ئەبو بەکر یان عومەر یان عوسمان یان عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت)، کە ئەوان چاکترین کەس بوونە لە ئوممەت... بەڵام وتەی ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە فەرمویەتی: ڕێگە پێدراوە تەبەڕوك کردن بە کەسانی چاك، ئەم قسەیە وانییە، لەبەرئەوەی تەبەروك تایبەتە بە شەخسی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە جێگیربووە، بەڵام غەیری ئەو، نابێت. (شرح سنن أبی داود (٥٧/٤). –وەرگێڕ–.**

(٤٧) أخرجه البخاري (٥٤٦٧) و (٦١٩٨)، ومسلم (٢١٤٥)، وهو في "مسند أحمد" (٣٤١/٣٢) (١٩٥٧٠) من زيادات ابنه عبدالله رحمه الله.

واته: له ئهبی موساوه (ڕهزای خوای لێبێت) دهفهرموویت: منداڵێكمان بوو، هێنام بۆلای پێغهمبهری خوا ﷺ ناوی نا إبراهيم، وه به خورما مهلاشوی شیرین کرد، وه دوعای بهرهکهتی بۆکرد.

❁ عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄: أَنَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، قَالَتْ: فَخَرَجْتُ وَأَنَا مُتِمٌّ، فَأَتَيْتُ المَدِينَةَ فَنَزَلْتُ قُبَاءً، فَوَلَدْتُ بِقُبَاءٍ، ثُمَّ « أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا، ثُمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ حَنَّكَهُ بِالتَّمْرَةِ، ثُمَّ دَعَا لَهُ فَبَرَّكَ عَلَيْهِ »[٤٨].

واته: له ئهسمائی کچی ئهبی بهکر (ڕهزای خوایان لێبێت) دوگیان بوو به عهبدوللای کوڕی زوبێر له مهککه، دهفهرموویت: دهرچوم وه منیش سكم له كۆتایدا بوو وهخت بوو منداڵهكهم دهبوو (نۆ مانگ بوو)، هاتینه مهدینه له قوباء لاماندا، منداڵهكهم بوو له قوباء، پاشان: هێنامان بۆلای پێغهمبهری خوا ﷺ خستییه كۆشیهوه، پاشان داوای خورمای كردو خستیه دهمیهوهو جوی، ئهوه یهكهم شت بوو كه چوه گهدهیهوه تفی دهم پێغهمبهری خوا ﷺ بوو، پاشان هەندێك له شیرینی ئهو خورما جویراوهی خسته دهمی منداڵهكه، پاشان دوعای بهرهكهتی بۆ كردو دهستی هێنا بهسهریدا.

---

(٤٨) أخرجه البخاري (٣٩٠٩) و(٥٤٦٩)، ومسلم (٢١٤٦) (٢٦)، وأحمد في "مسنده" ((٤٤/٥٠٤) (٢٦٩٣٨).

شیرین كردنی مەلاشوی دەكرێت لەگەڵ لە دایك بوبێت، وە مەبەست پێی ئەوەیە منداڵەكە ڕابهێنێت لەسەر خواردن، وە بەهێزی دەكات.

❁ ئیمامی ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: لە پێشتر ئەوەیە بە خورما بێت، ئەگەر دەست نەكەوت خورمای وشك، وە ئەوەش نەبو شتێكی شیرینو خۆش، وە هەنگوین لە پێشترە ئەگەر خورما نەبو[٤٩].

وە لە بەڵگەكانی شەرعییەتی لە كاتی لە دایكبوونی منداڵو سوننەتی شیرین كردنی مەلاشوی:

❁ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: كَانَ ابْنٌ لِأَبِي طَلْحَةَ يَشْتَكِي، فَخَرَجَ أَبو طَلْحَةَ، فَقُبِضَ الصَّبِيُّ، فَلَمَّا رَجَعَ أَبو طَلْحَةَ، قَالَ: مَا فَعَلَ ابْنِي، قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هُوَ أَسْكَنُ مَا كَانَ، فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ العَشَاءَ فَتَعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَتْ: وَارُوا الصَّبِيَّ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَبو طَلْحَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمَا» فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، قَالَ لِي أَبو طَلْحَةَ: احْفَظْهُ حَتَّى تَأْتِيَ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ ﷺ وَأَرْسَلَتْ مَعَهُ بِتَمَرَاتٍ، فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَمَعَهُ شَيْءٌ؟» قَالُوا: نَعَمْ، تَمَرَاتٌ، فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ ﷺ فَمَضَغَهَا، ثُمَّ أَخَذَ مِنْ فِيهِ، فَجَعَلَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ وَحَنَّكَهُ بِهِ، وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ »[٥٠].

---

(٤٩) "فتح الباري" (٩/٧٢٨) كتاب العقيقة، بَاب تَسْمِيَةِ الْمَوْلُودِ غَدَاةَ يُولَدُ لِمَنْ لَمْ يَعُقَّ عَنْهُ وَتَحْنِيكِهِ.

(٥٠) أخرجه البخاري (٥٤٧٠)، ومسلم (٢١٤٤) (٢٣).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: منداڵەکەی أَبِي طَلْحَةَ نەخۆش بوو، أَبو طَلْحَةَ لە ماڵ دەرچوو، منداڵەکەی مرد، دوای ئەوەی کە أَبو طَلْحَةَ گەڕایەوەو فەرمووی: چی بەسەر منداڵەکەمدا هات، أُمُّ سُلَيْم فەرمووی: لە جاران ئامترە، شەو أُمُّ سُلَيْم خواردنی پێداو پاشان خۆی لێ نزیك کردەوەو سەرجێیان کرد، لە دوای ئەوە أُمُّ سُلَيْم فەرمووی: منداڵەکەمان مردووەو ناشتمان، کاتێك کە ڕۆژ بووەوە أَبو طَلْحَةَ هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باسکرد، فەرمووی: ئایە ئەمشەو چوویتەتە لای خێزانت؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەت برژێنێت بەسەرتاندا، منداڵێکیان بوو، أُمُّ سُلَيْم دەفەرمووێت: أَبو طَلْحَةَ پێمی فەرمو: ئامادەیبکە منداڵەکە تا دەیبەینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بردیان بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵیدا چەند دەنکە خورمایەکیان هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ لێیانی وەرگرت، فەرمووی: هیچتان پێیە؟ فەرمویان: چەند دەنکە خورمایەك، پێغەمبەری خوا ﷺ وەریگرتو جوی، پاشان لە دەمی خۆی خستیە دەمی منداڵەکەو مەلاشوی پێ شیرین کرد، ناوینا عَبْد اللَّه.

❁ ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: زانایان یەکدەنگن لەسەر سوننەتێتی شیرین کردنی مەلاشوی منداڵ لە کاتی لە دایکبوونی.[٥١]

---

(٥١) السراج المنير شرح الجامع الصغير: (٨٩/٤).

## ٨- ناونانی منداڵ‌و نازناوی جوان، یەکێکە لە مافەکانی منداڵ بەسەر باوکی یەوە ئەوەیە ناوێکی خۆشی بنێت:

لە حەق‌و مافی منداڵ لەسەر باوکی ناوێکی خۆشی لێبنێت، لەم فەرموودەیەدا لە أبی داود: « إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ »[٥٢].

واتە: ئێوە بانگ دەکرێن لە ڕۆژی دواییدا بە ناوەکانتان‌و بە ناوی باوکتان ناوەکانتان جوان بێت.

عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: « أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُغَيِّرُ الِاسْمَ الْقَبِيحَ » رواه الترمذي[٥٣].

واتە: لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت): پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناخۆشی دەگۆڕی.

ناوی ئەبی بەکر کوڕی عبد الكعبةی گۆڕی بۆ عبدالله.[٥٤]

وە عبد الرحمن بن عوف ناوی عبد الكعبة بوو ناوی نا عبدالرحمن[٥٥].

---

(٥٢) حديثٌ ضعيفٌ: أخرجه أبو داود (٤٩٤٨)، مِنْ حديث أَبِي الدَّرْدَاءِ رضي الله عنه، وهو في "مسند أحمد" (٢٣/٣٦) (٢١٦٩٣). [صحيح وضعيف سنن أبي داود (٤٩٤٨)، سلسلة الأحاديث الضعيفة، رقم الحديث: (٥٦٤٠)].

(٥٣) حديث صحيح: أخرجه الترمذي (٢٨٣٩). [صحيح وضعيف سنن الترمذي، رقم الحديث: (٢٨٣٩)].

(٥٤) وعن عائشة، قالت: اسمه الذي سماه أهله به "عبد الله" ولكن غلب عليه "عتيق". "سير أعلام النبلاء – سير الخلفاء الراشدين" (ص: ٧).

(٥٥) "الاستيعاب" لابن عبدالبر ص: (٤٤٢-٤٤٣) (١٥٣٠)، "تهذيب الكمال" (٣٢٤/١٧) (٣٩٢٣).

وە ناوی (عاصية) کچی ثابت کوڕی (أبي الأقلح)ی گۆڕی بۆ (جَميلَة)[٥٦].

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللهِ عَبْدُ اللهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ » أخرجه مسلم[٥٧].

واتە: خۆشەویستترین ناوتان لەلای خوای گەورە عَبْدُ اللهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الْأَنْبِيَاءِ وَأَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَصْدَقُهَا حَارِثٌ وَهَمَّامٌ وَأَقْبَحُهَا حَرْبٌ وَمُرَّةٌ »[٥٨].

واتە: ناو بنێن بە ناوی پێغەمبەران، وە خۆشەویستترین ناو لەلای خوای گەورە (عَبْدُ اللهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ) وە ڕاستترینیان (حارث و هَمَّامٌ – چوستو چالاك) وە ناشرینترینیان (حَرْبٌ وَمُرَّةٌ – جەنگو بەڵاو نەهامەتی).

---

(٥٦) "الاستيعاب" ص: (٨٨١) (٣٢٤٥)، ئەویش خوشکی عاصم کوڕی ثابت کوڕی أبي الأقلح بوو، ژنی عومەری کوڕی خەطاب، نازناوی أُم عاصم کە منداڵەکەی ناوی عاصم کوڕی عومەری کوڕی خەطاب، ناوی عاصية بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی کردە جَميلة.

وانظر ما جاء في "صحيح مسلم" (٢١٣٩) (١٤) و (١٥).

(٥٧) أخرجه مسلم: (٢١٣٢)، والتِّرمذي (٢٨٣٣) (٢٨٣٤) مِنْ حَديثِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما.

(٥٨) حديث صحيح: أخرجه أبو داود (٤٩٥٠) والنسائي (٣٥٦٥) مِنْ حَديثِ أَبِي وَهْبٍ الْجُشَمِيِّ رضي الله عنه.

[صحيح أبي داودا: (٤٩٥٠)، وتراجعات الشيخ الألباني رحمه الله صحيح دون: "تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الْأَنْبِيَاءِ" رقم الحديث: (٢٩٣)].

❁ وَرَوى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ» قَالَ: اسْمِي حَزْنٌ، قَالَ: «بَلْ أَنْتَ سَهْلٌ» قَالَ: مَا أَنَا بِمُغَيِّرٍ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِي قَالَ ابْنُ الْمُسَيِّبِ: « فَمَا زَالَتْ فِينَا الحُزُونَةُ بَعْدُ »[٥٩].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب لە باوکییە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ناوت چییە؟ فەرمووی: ناوم حَزْنٌ (خەفەت) فەرموی: بەڵکو تۆ ناوت سَهْلٌ (ئاسانکاری) فەرمووی: ناوم ناگۆڕم کە ئەو ناوە باوکم لێمی ناوە، ابْنُ الْمُسَيِّبِ دەفەرمووێت: بەردەوام بە خەفەتباری لە ناومان مایەوە.

❁ ابن بَطَّال (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ئەوەی تێدایە کە فەرمانکراوە بە ناونانی باشو گۆڕینی ناو بۆ باشترین ئەمەش بۆ واجب نییە[٦٠]. بەڵکو بۆ سوننەتە.

## بەهەمان شێوە گۆڕینی ئەو ناوانەی کە تەزکییەی تێدایە:

❁ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ « زَيْنَب » أخرجه البخاري ومسلم[٦١].

واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) زەینەب ناوی (بَرَّةَ- چاکەکاری) بوو، پێی وترا: تەزکییەی نەفسی تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا زەینەب.

---

(٥٩) أخرجه البخاري (٦١٩٠)، وبنحوه عِنْدَ أبي داود ٤٩٥٦).

(٦٠) "فتح الباري" (١٠/٧٠٥) (٦١٩٠).

(٦١) أخرجه البخاري (٦١٩٢)، ومسلم (٢١٤١).

❁ وە جوەيريـەی نـاوی (بَـرَّةَ) بـوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ گـۆڕی بـۆ جوەيريەی، پێی ناخۆشبوو پێی بووترايە: ئەوە (بَرَّةَ) لای من دەرچو[٦٢].

❁ ئیمامی ابن القیم (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) باسـی دەكـات: كـە نـاو كاريگەری دەبێت لەسەر كەسەكان، وە كەسەكان كاريگـەريان دەبێـت لەسـەر ناوەكان لە باشیو خراپیدا،و لە سوكیو سەنگینیدا.

❁ وە ئیاس كـوڕی معاويـە (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) وە جگـە لـەويش كەسێكيان دەبينی دەيانووت[٦٣] ناوت چی يە؟

❁ وە ئیمامی عومەری كوڕی خەطـاب (ڕەزای خـوای لێبێـت)) پرسـياری لە پياوێك كرد، وتی: (جَمْرَةَ – پشكۆی ئاگر) فـەرمووی: نـاوی باوكـت؟ وتـی: (شِهاب – بلێسەی ئاگر) فەرمووی: خـەڵكی كوێن؟ وتـی: (الحُرَقَة – سـوتاو) فەرمووی: ماڵتان لە كوێيە؟ وتی: (بِحَرَّةِ النَّار – گەرميی ئاگر )، فەرمووی: لـە كوێ دادەنيشن؟ وتی: (بِذاتِ لَظَی – بلێـسەی ئـاگر ) فـەرمووی: بـڕۆ ماڵتـان سوتاوە. ڕۆيشت بينی بەوشێوازە بوو[٦٤].

هەروەكو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی (سُهيل) ی لێكدايەوە بە (سهولة – ئاسانكاری)، لە جەنگی حودەيبيە بەو شێوازە بوو.[٦٥]

---

[٦٢] أخرجه مسلم (٢١٤٠) من حديث ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما.

[٦٣] پێويستە ئەم كەسە ناوی ئاواو ئاوا بوايە وە هەڵەيان ناكرد (واتە: بە كردەوەو بە ڕەوشت ناويان دياری دەكرد). م. صلاح الدين عبد الكريم.

[٦٤] أخرجه مالك في "المُوَطَّأ" (٤٥٤/٢) (١٨٧١). وذكره ابن القيم في "زاد المعاد" (٣٠٨/٢).

[٦٥] انظر البخاري (٢٧٣١ و ٢٧٣٢) ئەوەی تێدايە لە فەرموودەكە، كاتێك سُهَيْلُ كوڕی عَمْرٍو هات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمويەتی: «لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ». واتە: بە تەئكيد كارەكەتان ئاسان بوو.

## كونیە:

بەڵام نازناو ئەگەر چاك‌و باش بوو ئەوا كاریگەری دەبێت لەسەر نەفس، وە ڕێزێكیشە بۆ ئەو كەسەی نازناوەكەی بۆ داناوە.

شاعیریش دەڵێت:

أُكَنِّيهِ حِينَ أُنَادِيهِ لِأُكْرِمَهُ ... وَلَا أُلَقِّبَهُ وَالسَّوْأَةُ اللَّقَبَ[٦٦]

واتە: كونیەی بۆ دادەنێم كاتێك بانگی دەكەم بۆ ڕێز گرتنی ... وە ناوو ناتۆرەی بۆ دانانێم ناوو ناتۆرەیەكی خراپ

وە كونیەش: بەوە دەبێت بووترێت باوكی فلان یان دایكی فلان، وە كونیەش ئەوەی لێوەردەگیرێت كە وەسفێك بێت بۆ كەسێكی دیاریكراو، وە زۆری بۆ خراپ بەكاردێت، بۆیە كونیەش وەك ڕێزە هەتا بۆ منداڵیش.

❁ پێغەمبەری خوا ﷺ كونیەی بۆ (أَبَا عُمَيْر) دانا كە منداڵ بوو یاری لەگەڵدا دەكردو پێ دەفەرمو: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟ »[٦٧].

❁ وە ئیمامی عومەری كوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: " عَجِّلُوا بِكُنَى أَوْلَادِكُمْ لَا تُسْرِعُ إِلَيْهِمْ الْأَلْقَابُ السُّوءُ "[٦٨].

واتە: پەلەبكەن لە دانانی نازناو بۆ منداڵەكانتان تا كەسانی تر ناوو ناتۆرەی خراپیان لێ نەنێن.

---

(٦٦) زاد المعاد (٢/٣١٤).

(٦٧) أخرجه البخاري (٦١٢٩) و(٦٢٠٣)، ومسلم (٢١٥٠)، والنسائي في "الكبرى" (٩/١٣٢) (١٠٠٢٩)، وأحمد في "المسند" (١٩/١٨٥) (١٢١٣٧) مِنْ حديث أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه.

(٦٨) "الآداب الشرعية" لابن مفلح (١/٤٨٠).

## ٩- گوێزەبانە:

لە پاش ئەوە پێویستە لەسەر موسڵمان کە ئاژەڵ سەرببڕێت لەبەرئەوەی منداڵیان بووە. کە سوننەتە، وە هەندێك لە زانایان بە واجبیان زانیوە. بۆ کوڕ دوو مەڕ، وە بۆ کچیش یەك مەڕ، سەردەبڕدرێت لە ڕۆژی حەوتەم، یان چواردەیەم، یان بیستو یەك، یان هەر ڕۆژێکی تر لە دوای ئەوە.

بەڵگەی گوێزەبانە لە شەرعدا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « كُلُّ غُلَامٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ وَيُحْلَقُ وَيُسَمَّى » رواه أصحاب السنن[٦٩].

واتە: هەموو منداڵێك کە لە دایك دەبێت بارمتەیە هەتا گوێزەبانەکەی بۆ دەکرێت لە ڕۆژی حەوتەم، وە سەری دەتاشرێتو ناوی لێدەنرێت.

### خیلاف هەیە لەسەر وتەی: « مُرْتَهِنٌ بِعَقِيقَتِهِ »[٧٠].

❁ ئیمامی أحمد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: مَعناهُ أَنَّهُ إِذَا مَاتَ طِفْلًا وَلَمْ يَعُقَّ عَنهُ لَم يَشْفَع فِي وَالِدِيه. وروي عنْ قَتادة: أَنَّهُ يَحرُمُ شَفَاعَتُهُم.[٧١]

---

(٦٩) حديث صحيح: أخرجه أبو داود (٢٨٣٨) واللفظ له، وابن ماجة (٣١٦٥)، والترمذي (١٥٢٢)، والنسائي (٤٢٢٠) مِن حديث سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، وانظر "مسند أحمد" (٣٣/٢٧١) (٢٠٠٨٣). صحيح وضعيف سنن أبي داود (٢٨٣٧).

(٧٠) حديث صحيحٌ: هذا لفظ رواية ابن ماجة (٣١٦٥)، والترمذي (١٥٢٢)، سنن ابن ماجة تحقيق: الشيخ الألباني رحمه الله: (٣١٦٥).

(٧١) مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح (٧/٢٦٨٨).

واتە: ئەگەر بە منداڵی بمرێت‌و گوێزەبانەی بۆ نەكرابێت، ئەوا شەفاعەت بۆ دایك‌و باوكی ناكات. وە ڕیوایەت كراوە لە قەتادەوە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ناتوانێت شەفاعەتیان بۆ بكات.

❁ واتە: گەشە دەكات گەشەكردنێكی صاڵحانە، وە دەپارێزرێت پاراستنێكی تەواو بەهۆی ئەو گوێزەبانەوە كە بۆی كراوە.

❁ ئیمامی ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: " فَكَانَتِ الْعَقِيقَةُ فِدَاءً وَتَخلِيصاً لَهُ مِن حَبسِ الشَّيْطَانِ لَهُ وَسِجنه "[٧٢].

واتە: ئەو گوێزەبانەیە دەیپارێزێت‌و ڕزگاری دەكات لە بەندكردنی شەیتان‌و سجن كردنی.

❁ ئیمامی خَطَّابِي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: " اختَلفَ النَّاسُ فِي هَذَا، وأجوَدُ مَا قيلَ فِيه مَا ذَهب إِلَيه أَحمدُ بنُ حَنبل قالَ: هَذَا فِي الشَّفاعَةِ يُرِيدُ أَنهُ إِذا لَم يُعَقَّ عَنهُ فَمات طِفْلًا لَم يَشْفَع فِي أَبويِه "[٧٣].

واتە: زانایان خیلافیان هەیە لەسەر ئەمە، جوانترینیان كە وترابێت ئەوەیە كە ئیمامی أحمد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بۆی چوە، فەرموویەتی: ئەمە لە شەفاعەتە، مەبەست پێی ئەوە ئەگەر گوێزەبانەی بۆ نەكرێت‌و بمرێت بە منداڵی شەفاعەت بۆ دایك‌و باوكی ناكات.

---

(٧٢) تحفة المودود بأحكام المولود، لاپەڕە: (٧٤).

(٧٣) "عون المعبود شرح سنن أبي داود" وانظر "مسند الإمام أحمد" (٣٣/٢٧٤-٢٧٥)، و "زاد المعاد" لابن القيم (٢/٢٩٧).

## ئاگاداركردنـەوە لـە چـەند بابـەتێك كـە پەیوەنـدی هەیـە بـە گوێزەبانەوە:

١- ئـەم گوێزەبانەیـە خـیلاف هەیـە لەسـەر واجبێتـی، وە قـسەی تـەواو ئەوەیە كە واجبە لەبەرئەو فەرمودانە كە فەرمان دەكات بە كردنی گوێزەبانە، وە هیچ فەرموودەیەكی تر لە واجبێتی لایناباتـ.

٢- كاریگەری دەبێت لەسەر گەشەكردنی ئەو منداڵە.

٣- وە ئەمـە شـوكرانەكردنی خـوای گەورەیـە لەسـەر ئـەو نیعمەتـە كـە نیعمەتی منداڵە.

٤- وە ئەمە كوڕو كـچیش دەگرێتـەوە، هـەروەكو لـە فـەرمودەی: أُمِّ كُرْزٍ رضي الله عنها أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْعَقِيقَةِ قَالَ: « عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ لَا يَضُرُّكُمْ ذُكْرَانًا كُنَّ أَوْ إِنَاثًا »[٧٤].

واتە: ئوم كورز (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: گـوێم لـە پێغەمبـەری خوا ﷺ بوو دەربارەی گوێزەبانە دەیفەرمو: بـۆ منـداڵی كـوڕ دوو مـەڕ وە بـۆ منداڵی كچ یەك مەڕ وە ئەو ئاژەڵـەی سـەری دەبـڕن نێـر بێـت یـان مـێ هیـچی تێدانییە.

بەشـێوەی قوربانییـە لای هەنـدێك لـە زانایـان، دروسـت نییـە ئەمانـەی تێـدابێت: شـەلێكی زۆر ئاشـكرا، پیربێـتو مـۆخی تێـدا نـەمابێت، وە نەخۆشـییەكی زۆر ئاشـكرا بێـت، وە كـوێر بێـت، وە هـیچ لـە گۆشـتەكەی

---

[٧٤] حديث صحيح: صحيح وضعيف سنن أبي داود، رقم الحديث: (٢٨٣٥).

نافرۆشرێت، وە پێستەکەی نافرۆشرێت، خۆیان لێی دەخۆن، لێی دەبەخشن، لێی دەخۆن.[٧٥]

## وە لەو سوننەتانەی تر پێغەمبەری خوا ﷺ هانمانیداوە بۆی:

### تاشینی سەری منداڵە:

❁ ئیمامی ابن القیم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: قَالَ أَبو عمر بن عبد الْبر: أما حلق رَأس الصَّبِي عِنْد الْعَقِيقَة فَإِن الْعلمَاء كَانُوا يستحبوون ذَلِك[٧٦].

واتە أبو عمر بن عبد الْبر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: تاشینی سەری منداڵ لە کاتی گوێزەبانە ئەوا زانایان بە سوننەتیان داناوە.

❁ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: عَقَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الحَسَنِ بِشَاةٍ، وَقَالَ: « يَا فَاطِمَةُ، احْلِقِي رَأْسَهُ، وَتَصَدَّقِي بِزِنَةِ شَعْرِهِ فِضَّةً »، قَالَ: فَوَزَنَتْهُ فَكَانَ وَزْنُهُ دِرْهَمًا أَوْ بَعْضَ دِرْهَمٍ.[٧٧]

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی طالبەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێزەبانەی بۆ حەسەن کرد بە یەك مەڕ، وە فەرمووی:

---

(٧٥) وە هەیە لە زانایان دەفەرموون: جیاوازە لە قوربانی‌و ئەو مەرجانەیش نەبێت ئاسایی یەو پێویست نی یە. (م. صلاح الدین عبد الكريم).

(٧٦) تحفة المودود بأحكام المولود، لاپەڕە: (٩٧).

(٧٧) حديث حسن: أخرجه الترمذي (١٥١٩) منْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه. صحيح وضعيف سنن الترمذي: (١٥١٩).

ئەی فاطمة، سەری منداڵەکەت بتاشە، بە ئەندازەی کێشی قژەکەی زیو بکڕەو بیکە بە خێر، دەفەرمووێت: منیش: کێشاm‌و وەزنەکەی درهەمێك یان چەند درهەمێك بوو.

## ١٠- شیرپێدانی منداڵی تازە لە دایك بوو:

پاشان پێویستە لەسەر دایك شیر بدات بە منداڵەکەی تا کاتی ئەوەی خواردن دەخوات.

شیری سروشتی دایك: کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لەسەر گەشەکردنی منداڵ‌و تەندروستییەکەی.

خوای گەورە ڕێنمایی ئافرەتەکان دەکان کە شیر بدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو بۆ کەسێك کە بیەوێت شیرپێدانەکەی تەواوبکات. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ [البقرة: ٢٣٣ ].

واتە: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ وە دایکان شیر بە منالەکانیان ئەدەن دوو ساڵی تەواو ئەمە خەبەرە بەڵام مانای ئەمری تیایە واتە: پێویستە دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بە منالەکانیان بدەن ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ بۆ کەسێك کە بیەوێ دوو ساڵەکە تەواو بکات.

لەبەرئەوەی منداڵ هەست بە سۆزی دایکەکەی دەکات کاتێك شیری پێدەدات، وە پێویستی بەوەیە.

وە جێگیربووە لە زانستی پزیشكی سەردەم ئەو منداڵانەی كە شیری دەستكردیان (شیری قوتو) دەدەنێ زیاتر ڕووبەڕوی نەخۆشیو مردن دەبنەوە.

هەروەكو چۆن شیری سروشتی بەسودە بۆ تەندروستی دایك خۆی بۆ رەحمی لە پاش منداڵبوونی، وە بۆ هەرسكردنی.

هەروەكو چۆن ئیسلام هانیداوە لەسەر ئەوەی شیر بدات بە منداڵەكەی، ڕێیشی پێداوە ڕۆژوو نەگرێت لە مانگی ڕەمەزان ئەگەر ڕۆژووەكە كاریگەری هەبوو لەسەر شیرپێدانی بە منداڵەكەی.

وە لەوانەیە لە هۆكاری نەبونی سۆزی زۆرێك لە منداڵەكان بۆ دایكیان، وە زۆری سەرپێچیكردنی مافی دایك لەم سەردەمە بەهۆی ئەوەوە بێت شیری سروشتی بە منداڵەكانیان نادەن بەڵكو شیری دەستكردیان دەدەنێ.

وە شیر كاریگەری دەبێت لەسەر ئەو منداڵە ئەوەی كە شیرەكەی داوە پێی، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لە: « أَنْ تُستَرضَعَ الحمقاء ».[٧٨]

واتە: كە ئافرەتی بێئەقڵ شیر بدات.

❁ ابن قاسم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت لە "حاشية الروض" قال: وحكى القاضي، أن من ارتضع من امرأة حمقاء خرج الولد أحمق، ومن ارتضع من سيئة الخلق تعدى إليه، ومن ارتضع من بهيمة كان بليدا كالبهيمة.[٧٩]

---

(٧٨) حديث ضعيف: رواه أبو داود في "المراسيل" (٢٠٧)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٧/٤٦٤) (١٥٦٨٢).

(٧٩) "حاشية الروض المربع" (٧/١٠٦) للشيخ عبدالرحمن بن محمد بن قاسم.

واتە: دەگێڕنەوە لە القاضي فەرموویەتی: هەر ئافرەتێکی گێل‌و نەزان شیر بدات ئەوا منداڵەکەشی گێل‌و نەزان دەبێت، وە کەسێکی ئەخلاق ناشرین شیر بدات ئەوا منداڵەکەشی وا دەبێت، وە ئەگەر شیری ئاژەڵی بداتێ ئەوا منداڵەکەیشی وەکو ئاژەڵەکە بێ عەقڵ دەردەچێت.

وە ابن قدامە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە "المغني"[٨٠] فەرموویەتی: "فإنَّهُ يُقال: إنَّ الرضاع يُغيِّر الطباع"

واتە: لەبەرئەوەی دەوترێت: شیرپێدان خوو سروشتی منداڵەکە دەگۆڕێت.

ئەی چی دەڵێیت بۆ ئەم شیرانەی ئەمڕۆ دروستکراوە کە نازانرێت لە چی دروستکراوە، وە کێش دروستی کردوە.

## ١١- دوعا کردن بۆی:

هەرچەند دایک‌و باوك هەڵبدەن‌و درێخی نەکەن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان ئەگەر یارمەتی خوای گەورەی لەگەڵدا نەبێت‌و تەوفیقیان نەدا بۆی سودی نابێت.

بۆیە پەیوەستبە بە دوعاکردنەوە، وە بە زەلیلیەوە بۆلای خوای گەورە بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی منداڵەکەت بدات.

دوعاکردن لە دیارترین ئەو شتانەیە کە یارمەتیدەرە لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ.

---

(٨٠) المغني والشرح الكبير (٩/٢٢٩).

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ [البقرة: ١٨٦].

واتـە: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾ ئـەی محمـد ﷺ ئەگـەر بەندەکانی من پرسیاری منیان لێت کرد ئـەوە مـن لێیانـەوە نـزیکم بـە زانـست و زانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵات و ویست و ئیرادە، بـەڵام زاتـی پـیرۆزی خوای گەورە لەسەر عەرشە ﴿أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ هەر کەسێك لـە مـن بپاڕێتـەوە ئـەوا وەڵامـی ئەدەمـەوە یـان ئـەوەتا بـۆی جێبـەیٚ ئەکـەم، یـان بـە ئەندازەی ئـەوە بـەڵاو موسـیبەتی لەسـەر لائـەدەم، یـان لـە قیامەتـدا پاداشـتی ئەدەمەوە.

وە لە دوعای بەندەچاکەکانی خـوای گـەورە: ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾ [الفرقان: ٧٤].

واتە: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ وە ئـەو کەسانەی ئەڵێن: ئەی پەروەردگار لە خێزانەکان و منداڵەکانمان چاوروناکیمان پێ ببەخشە کە ببنە هۆی ڕووناکی چاومان بەوەی کە تاعـەت و عیبـادەتی تـۆ بکەن ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ وە بمانکـە بـە پێـشەوا بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە تەقوای خوای گەورە ئەکەن و لە چاکەدا خەڵکی چاومان لێ بکەن.

وە ئەوە خەلیل‌و خۆشەویستی خـوا بـاوكی پێغەمبـەران (إبراهیم) (عَلَيْهِمْ الـصَّلَاةُ وَالـسَّلَامُ ) دەپاڕێتـــەوە بـــۆ نـــەوەكانی: ﴿وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ﴾ [إبراهیم: ٣٥].

واتە: وە خۆم و نەوەكانم بپارێزە لەوەی كە بت بپەرستین (كە ئیبراهیم ئەم دوعایە بكات ئێمە ئەبێ زیاتر لە خۆمان بترسین‌و ئەم دوعایە بۆ خۆمـان‌و دایـك‌و باوك‌و نەوەكانمان بكەین).

وە فەرموویـــەتی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي ﴾ [إبراهیم: ٤٠].

واتە: ئەی پـەروەردگار وام لـێ بكـە بـەردەوام نوێـژەكانم ئـەنجام بـدەم وە نەوەكانیشم بەهەمان شێوە.

وە خـــوای گـــەورە فەرموویـــەتی: ﴿قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ [الأحقاف: ١٥].

واتە: ﴿قَالَ ربِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ﴾ ئەڵێ: ئەی پەروەردگار وەكو ئیلهام بیخەرە دڵم‌و یارمەتیم بدە لەسەر ئـەوەی كە شوكری ئەو نیعمەتە زۆرانەی تۆ بكەم كە ڕژاندوتە بەسەر منـدا وە بەسـەر دایـك و باوكمـدا ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ﴾ وە یارمـەتیم بـدە بـەوەی كـە كـردەوەی چـاك بكـەم كردەوەیـەك كـە تـۆ پێـی ڕازی بیـت ﴿وَأَصْلِحْ لِي فِي

﴿ذُرِّيَّتِي﴾ وە لە نەوەكانیشم نەوەی صالّح و چاكم پێ ببەخشە ﴿إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾ من تەوبە ئەكەم‌و ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ، وە من یەكێكم لە موسڵمانان لەوانەی خۆیان تەسلیمی تۆ ئەكەن، (ئەم ئایەتە ڕێنماییە بۆ ئەو كەسانەی كە تەمەنیان دەگاتە چل ساڵ تەوبە نوێ بكەنەوەو عەزیمەتیان هەبێت بەردەوام بن لەسەری).

وە خوای گەورە دەبارەی خێزانەكەی عیمران فەرموویەتی: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ [آل عمران: ٣٦].

واتە: من پەنای خۆی‌و نەوەكانیشی ئەگرم بە تۆ لە شەیتانی نەفرین لێكراو و ڕەجم كراو، خوایە خۆی و نەوەكانی بپارێزە، خوای گەورە دوعاكەی قبوڵ كردو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێت: هیچ منداڵێك نییە لە دایك بێت ئیلا شەیتان ئازاری دەدات بۆیە بە گریانەوە لە دایك دەبێت تەنها عیسى ﷺ و دایكی نەبێت

وە لە صەحیحەین هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن‌و حوسێنی پەنا دەداو دەیفەرمو: « أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ » وَكَانَ يَقُولُ: « هَكَذَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ أَبِي يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ »[٨١].

واتە: پەناتان دەدەم بە ناوو وشە جوان‌و تەواوەكانی خوای گەورە كە بریتی یە لە قورئان لە هەموو شەیتانێك‌و گیانداو زیندەوەرێكی زیانبەخش

(٨١) أخرجه البخاري (٣٣٧١)، وأبو داود (٤٧٣٧)، وابن ماجة (٣٥٢٥)، والترمذي (٢٠٦٠)، وهو في "مسند أحمد" (٢٠/٤) (٢١١٢).

(مارو....)، وە لە هەموو چاوێکی پیس و تێڕوانینێکی خراپ. وە دەیفەرمو: ئەمە پێغەمبەر إبراهیم منداڵەکانی (إسماعیل و إسحاق)ی پێ پەنا دەدا.

بە داخێکی زۆرەوە زۆرێك لە ئافرەتانی ئەمڕۆ، وە هەندێك لە باوکان لە جێی ئەوەی دوعا بۆ منداڵەکانیان بکەن کاتێك تووڕە دەبن دوعایان لێ دەکەن.

لەبەرئەمە پێویستە واز لەو کارەیان بهێنن و دووربکەونەوە لەوەی دوعایان لێ بکەن.

❁ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لَا تُوَافِقُوا مِنَ اللهِ سَاعَةً يُسْأَلُ فِيهَا عَطَاءٌ، فَيَسْتَجِيبُ لَكُمْ » رواه مسلم[٨٢].

واتە: دوعا لە خۆتان مەکەن، وە دوعا لە منداڵەکنتان مەکەن، وە دوعا لە سەروەت و ماڵتان مەکەن، نەوەکو بکەوێتە ئەو کاتەوە هەرکەسێك داوایەکی هەبێت و بپاڕێتەوە پاڕانەوەکەی گیرا دەبێت.

وە چەندەها کەس هەیە دوعای بۆ منداڵەکانی کردووە، پاڕایەوە لە بەرەبەیان، وە داوای لە خوای گەورە کرد کە دوعاکان دەبیستێت وەڵامی لێ قاوماوان دەداتەوە، خوای گەورە وەڵامی دوعاکانی دایەوە، منداڵەکانی بۆ چاك کردو نەوەکانی بۆ چاك کرد. بۆیە پێویستە بە دوای ئەو کاتانەدا بگەڕێین کە دوعای تێدا وەڵام دەدرێتەوە.

---

(٨٢) أخرجه مسلم (٣٠٠٩) من حديث جابر الطويل رضي الله عنه.

لە ئەبی ئومامەوە (ڕەزای خوای لێبێت)، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی کاتێك وەڵامی دوعا دەدرێتەوە؟ فەرموی: « جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ المَكْتُوبَاتِ » رواه الترمذي(٨٣).

واتە: لە کۆتایی شەودا، لە دوای نوێژە فەرزەکان.(٨٤)

وە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ، وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ »(٨٥).

واتە: نزیکترین کات بەندە لە پەروەردگاری، لە کاتی سوجدەیە، بۆیە زۆر دوعا بکەن.

وە گەڕان‌و هەوڵدان بۆ هەندێ کاتی تر کە دوعای تێدا قەبوڵە وەکو ڕۆژی هەینی، وە لە کاتی سەفەر،و لە کاتی ڕۆژووشکاندن،و لە کاتی باران باریندا، وە دورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی گیرانەبونی دوعا: وەکو خواردنی حەرام‌و لەبەرکردنی شتی حەرام.

---

(٨٣) حديث حسن: صحيح وضعيف الترمذي (٣٤٩٩).

(٨٤) شێخ عبدالرزاق البدر دەفەرمووێت: دوای نوێژە فەرزەکان، مەبەست پێی پێش سەلامدانەوەیە لە نوێژ، شيخ الإسلام و ابن القيم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت فەرموویانە. فقه الأدعية والأذكار (١٠٣/٢). –وەرگێڕ–

(٨٥) أخرجه مسلم (٤٨٢)، وأبو داود (٨٧٥)، وأحمد في "المسند" (٢٧٤/١٥) (٩٤٦١).

## ١٢- فێرکردنی منداڵ بۆ وشەی یەکخواپەرستی:

یەکەم شتێك کە منداڵ دەستی پێبکات‌و بیڵێت پێویستە لەسەر دایك‌و باوك منداڵەکەیان فێربکەن ئەویش وشەی یەکخواپەرستییە، پێی بڵێتەوە.

لە ابن عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوەو فەرموویەتی: « افتحوا على صِبْيَانكُمْ أول كلمة بِلَا إِلَه إِلَّا الله ولقنوهم عِنْدَ الْمَوْت لَا إِلَه إِلَّا الله »[٨٦]

واتە: یەکەم شتێك کە منداڵەکانتانی فێردەکەن با بە لَا إِلَه إِلَّا الله بێت، وە تەلقینیان بدەن بە لَا إِلَه إِلَّا الله لە کاتی سەرەمەرگ.

وە أُم سُلَيم (ڕەزای خوای لێبێت) تەلقینی کوڕەکەی أنس (ڕەزای خوای لێبێت) دەکرد پێی دەفەرمو بڵێ: لَا إِلَه إِلَّا الله، بڵێ: أشهد أن محمداً رسول الله[٨٧]. ئەمە پێش لە شیر برینەوە بوو.

وە پێویستە لەبەرچاوی دوبارە بکرێتەوە وە بە تایبەتی دایك کە لەگەڵی یاری دەکات، کاتێك ڕاهات لەسەری، ئەو کاتەی پێگەیشت بە ئاسانی بۆی مانا دەکەیت‌و ئەویش لێی تێدەگات.

---

(٨٦) حديث باطل: أخرجه البيهقي في "الجامع لشعب الإيمان" (١٢٨/١١) (٨٢٨٢) وذكره السيوطي في "اللآلئ المصنوعة" (٤١٦/٢)، وابن عراق في "تنزيه الشريعة" (٣٦٤/٢-٣٦٥) ونسباه للحاكم في "المستدرك". [سلسلة الأحاديث الضعيفة (٦١٤٦)].

(٨٧) "سير أعلام النبلاء" (٣٠٥/٢).

وە فێردەکرێت کە خوای گەورە تاك‌و تەنهایەو هاوبەشی نییە، وە هەر خوای گەورە دروستکارە، وە لە ئاسمانە، وە بۆ سەر عەرش بەرزو بڵند بووەتەوە، وەئاگای لێمانەو تەماشان دەکات، زانایە بە حاڵمان، دەبیستێت‌و دەبینێت، وە بە تواناو بە دەسەڵاتە بەرامبەر بە هەموو شتێك.

ڕایبهێنی لەسەر پشت بەستن بە خوای گەورە، وە هەر خوای گەورە خۆیەتی شیفا دەدات، وە ئەوەی واجبە لەسەر مان خوای گەورەمان خۆش بووێت‌و عیبادەتی بۆ بکەین، وە بەهەمان شێوە فێری خۆشەویستی پێغەمبەری خوای ﷺ بکەین، وە باسی هەندێك لە ئەخلاق‌و شێوەی بۆ بکەین، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ منداڵی خۆشویستوەو یاری لەگەڵدا کردون‌و لەو شتانەی تر کە منداڵ وەریبگریت‌و لێی تێبگات.

وە ئەوەی لێ دوبارە بکەینەوە: "خوات کێیە؟ پێغەمبەرەکەت کێیە؟ دینەکەت چییە؟" وە "خوای گەورە لە کوێیە؟".

وە فێری خۆشەویستییان بکەیت بۆ هاوەڵان‌و پیاوچاکان (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت)، وە سورەتی فاتیحەو ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ فێر بکەین.

### ١٣- فێری هەندێك ئاداب‌و ئەخلاقی جوانیان بکەین:

لە پاش شیر بڕینەوەی منداڵ لەم قۆناغەدا دڵ‌و دەرونێکی پاکی هەیە، وە پێی خۆشە لاسایی بکاتەوە، وەکو هەویرێکی ئاسان وایە، ئەم قۆناغە بە کەم مەزانەو مەڵێ: جارێ منداڵەو عەقڵی پێدانا شکێت.

قَدْ يَنْفَعُ الْأَدَبُ الْأَحْدَاثَ فِي مَهَلٍ ... وَلَيْسَ يَنْفَعُ بَعْدَ الْكِبَرِ الْأَدَبُ

إِنَّ الْغُصُونَ إِذَا قَوَّمْتَهَا اعْتَدَلَتْ... وَلَا تَلِينُ إِذَا قَوَّمْتَهَا الْخُشُبُ[٨٨]

واتە: ئەدەب سودی دەبێت لە منداڵیدا ... لە دوای گەورەبوون ئەدەب سودی نابێت

نەمام بە بچوكی ڕاست دەبێتەوە ... كە بوو بە دار ڕاست نابێتەوە

فێری ئەدەبی خواردن،و خەوتن،و سەلام كردن،و وەرگرتنو بەخشین بە دەستی ڕاست،و (الْحَمْدُلِلَّه) بكات كاتێك پژمی، وە جوابی ئەو كەسە بداتەوە كە دەپژمێت،و بەهەمان شێوە ڕاستگۆییو دەست پاكی.

عَنْ الوَلِيدُ بْنُ كَثِيرٍ: أَخْبَرَنِي أَنَّهُ سَمِعَ وَهْبَ بْنَ كَيْسَانَ، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ، يَقُولُ: كُنْتُ غُلاَمًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « يَا غُلاَمُ، سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ » فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ[٨٩].

واتە: لە وەلیدی كوڕی كەسیر دەفەرمووێت: گوێم لێبوو وەهبی كوڕی كەیسان، گوێم لێبوو عومەری كوڕی أبي سەلەمە، دەفەرمووێت: منداڵ بووم لە باوەش پێغەمبەری خوا ﷺ، لەملاو ئەولاوی قاپەكە نانم دەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: « ئەی منداڵەكە، بِسْمِ الله بكە، وە بە

---

(٨٨) "الآداب الشرعية لابن مفلح" (٣/٥٢٣-٥٢٤).

(٨٩) أخرجه البخاري (٥٣٧٦)، ومسلم (٢٠٢٢) (١٠٨)، وأحمد في "المسند" (٢٦/٢٥٢) (١٦٣٣٢).

دەستی ڕاست بخۆ، وە لە بەردەمی خۆت بخۆ » لە دوای ئەوە هەرگیز بەو شێوازە نانم نەخوارد.

وە دوری بخەیتەوە لە ئەخلاقی ناشرین وەك درۆ،و خۆویستی،و حەسودی بە براكانی.

وە لەوانەی تر كە پێویستە لەسەر دایكو باوك منداڵەكانیان ئاگاداربكەنەوە لە حەرام، هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەنی ئاگاداركردەوە لە خواردنی زەكات لەبەرئەوەی ئەو لە ئالو بەیتە، وە زەكات بۆ ئەوان حەڵاڵ نییە.

✿ لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: حەسەنی كوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێبێت) دەنكە خورمایەكی هەڵگرت لە خورمای زەكات كردیە دەمییەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمو: « **كِخْ كِخْ**[٩٠]، **ارْمِ بِهَا، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّا لَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ؟** »[٩١].

واتە: كخ كخ فڕێی بدە ئایە نەتزانیوە كە ئێمە زەكات ناخۆین.

---

(٩٠) قال القاضي رحمه الله كلمة يزجر بها الصبيان عن المستقذرات فيقال له كخ أي اتركه وارم به. (شرح صحيح مسلم للنووي رحمه الله: (٧/١٧٥). واتە: وشەیەكە بۆ منداڵ بۆ ئەوەی واز لە شتی پیس بهێنێت پێی دەوترێت: كِخ: واتە وازی لێهێنەو فڕێی بدە. –وەرگێڕ–

(٩١) أخرجه البخاري (١٤٩١)، ومسلم (١٠٦٩) (١٦١).

وە لە عبداللە کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێت): رَأَى ابْنُ مَسْعُودٍ ابْنًا لَهُ عَلَيْهِ قَمِيصٌ مِنْ حَرِيرٍ فَشَقَّهُ، وَقَالَ: " إِنَّمَا هَذَا لِلنِّسَاءِ "[٩٢].

واتە: منداڵێکی خۆی بینی قەمیسێکی لەبەربوو لە حەریر دڕاندیو پێی فەرموو: ئەمە تایبەت بە ئافرەتانە.

واجبە لەسەر دایکو باوك ڕێگری بکەن لە منداڵەکەیان لە حەرام، هەرچەندە قەڵەمیشی لەسەر نیە، چونکە ئەگەر ڕاهات لەسەر حەرام بە منداڵی خوی پێوە دەگرێت لە گەورەیی، وە قورس دەبێت لەسەری ئەگەر وازی لێبهێنێت.

وە پێویستە لەسەر دایك کە کچەکەی ڕابهێنێت لەسەر شەرمو حەیاو دورکەوتنەوە لە پیاوانی بێگانە کە حەرامە بۆ ئەو، وە لەبەرکردنی پۆشاکی شەرعی،و دورکەوتنەوە لەو پۆشاکانەی کورتن کە زۆرێك لە موسڵمانان پێوەی گیرۆدەبوونە.

## ١٤- نەرمو نیان بوون لەگەڵیانو یاری کردن لەگەڵیان:

گومانی تێدانییە کە نەرمونیان بوونو یاری کردن لەگەڵ منداڵ کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر گەشەکردنی منداڵ گەشەکردنێکی تەواوو دروست؛ لەبەرئەوەی یاریکردن بەشێکە لە ژیانی لێی جیا نابێتەوە.

یاریکردنی منداڵ بە کەم مەزانە، لەگەڵ سروشتیان تێکەڵ بووەو لەسەری ڕاهاتون، بەڵکو تێکەڵی یارییەکانی منداڵبە،و یاریان لەگەڵدا بکەو

---

([٩٢]) أخرجه ابن أبي شيبة في "المصنف" (٥/١٥٢) (٢٤٦٥٥).

نەرمو نیان بە هەتا خۆشتیان بوویێت،و دڵخۆش بن پێت،و گوێ بگرن بۆ ئامۆژگارییەکانت وە ڕوو لە تۆ بکەن، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرمووێت: ﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَ ﴾ [آل عمران: ١٥٩].

واتە: ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ﴾ ئەی محمد ﷺ بەهۆی ڕەحمەتی خوای گەورەوە بەسەر تۆوە تۆ ئاوا نەرم و نیان بوی لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەرت ﴿وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ﴾ وە ئەگەر تۆ کەسێکی قسەخراپو ڕەوشت خراپو ڕەق و وشك و دڵڕەق بویتایە ﴿لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾ ئەوا لە دەورت دور ئەکەوتنەوە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین و چاکترین کەس بووە بۆ ماڵ و منداڵەکانی وەکو فەرموویەتی: « خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي » [٩٣].

واتە: چاکترینتان ئەوەیە کە چاکترینیان بێت بۆ خاوو خێزانی، وە من چاکترینتانم بۆ خاوو خێزانم.

---

(٩٣) حديث صحيح: رواه الترمذي (٣٨٩٥) مِنْ حديث عَائِشَةَ رضي الله عنها. [صحيح وضعيف سنن الترمذي (٣٨٩٥)].

ورواه ابن ماجة (١٩٧٧) من حديث ابنِ عَبَّاس رضي الله عنهما.

أما حديث الذي أخرجه الحاكم عن أَبِي هُرَيرَةَ فلفظه: « خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي مِنْ بَعْدِي » أخرجه الحاكم في "المستدرك" (٣/٣٥٢) (٥٣٥٩) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي. [حديث حسن: صحيح الجامع الصغير وزيادته (٣٣١٥)]. **واتە: چاکترینتان چاکترینتانە بۆ کەس و کاری داهاتووم.**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُدْلِعُ لِسَانَهُ لِلْحُسَيْنِ، فَيَرَى الصَّبِيُّ حُمْرَةَ لِسَانِهِ، فَيَهَشُّ إِلَيْهِ [٩٤].

واتە: وە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زمانی بۆ حوسێن دەركردوە، حوسێنیش بینیوێتنی سوری زمانی، دڵی پێخۆشبوو.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ یاری لەگەڵ براكەی أنس كوڕی مالك (ڕەزای خوای لێبێت) دەكردو دەیفەرموو: « أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟ »[٩٥]

ئەی ئەبو عومەیر چۆلەگەكە چی بەسەر هات؟

وە جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای كەسێكدا تێپەڕی لە هۆزی (أَسْلَم) كە تیری دەهاویشت، فەرمووی: «ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ، فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا ارْمُوا، وَأَنَا مَعَ بَنِي فُلاَنٍ» قَالَ: فَأَمْسَكَ أَحَدُ الفَرِيقَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا لَكُمْ لاَ تَرْمُونَ؟»، قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَأَنْتَ مَعَهُمْ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْمُوا فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ» رواه البخاري[٩٦].

واتە: « تیر بهاوێژن ئەی نەوەی ئیسماعیل، ئێوە باوكتان تیر هاوێژبوو، وە منیش لەگەڵ نەوەی فلانم » دەفەرمووێت: یەكێك لەو دوو كۆمەڵە

---

(٩٤) حديث صحيح: أخرجه ابن حبان في "صحيحه" (٤٠٨/١٢) (٥٥٩٦)، و(٤٣١/١٥) (٦٩٧٥). [التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان، رقم الحديث: (٥٥٦٧)].

(٩٥) أخرجه البخاري (٦١٢٩) و (٦٢٠٣)، ومسلم (٢١٥٠).

(٩٦) أخرجه البخاري (٢٨٩٩) منْ حديث سَلَمَةَ بْنَ الأَكْوَعِ رضي الله عنه.

دەستیان گرتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرمو: « ئەوە بۆچی تیر ناهاوێژن؟ » فەرمویان: چۆن تیر بهاوێژین كە تۆ لەگەڵ ئەوانی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « تیر بهاوێژن ئەوە من لەگەڵ هەمووتانم ».

❁ وە لە عبداللە كوڕی حارثەوە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: " كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصُفُّ عَبْدَ اللهِ وَعُبَيْدَ اللهِ وَكَثِيرًا بَنِي الْعَبَّاسِ، ثُمَّ يَقُولُ: « مَنْ سَبَقَ إِلَيَّ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا »، قَالَ: فَيَسْتَبِقُونَ إِلَيْهِ فَيَقَعُونَ عَلَى ظَهْرِهِ وَصَدْرِهِ فَيُقَبِّلُهُمْ وَيَلْتَزِمُهُمْ " رواه أحمد[٩٧].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عبداللە و عبیداللەو زۆرێك لە نەوەكانی بەنی عباس (ڕەزای خوایان لێبێت) ڕیز دەكرد، پاشان دەیفەرموو: « كێ پێش دەكەوێت‌و زووتر دەگات بە من ئەوا ئەوەندەو ئەوەندەی دەدەمێ »، ئەوانیش پێشبڕكێیان دەكردو خۆیان دەدا بەسەر پشت‌و سنگی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش ماچیانی دەكردو باوشی پیادا دەكردن.

❁ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: فَكُنَّ يَأْتِينِي صَوَاحِبِي، فَكُنَّ إِذَا رَأَيْنَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْقَمِعْنَ مِنْهُ، فَكَانَ ﷺ يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ يَلْعَبْنَ مَعِي "[٩٨].

---

(٩٧) حديث ضعيف: أخرجه أحمد في "المسند" (٣/٣٣٥) (١٨٣٦). [سلسلة الأحاديث الضعيفة (٦٥٤٧)].

(٩٨) أخرجه البخاري (٦١٣٠)، ومسلم (٢٤٤٠) منْ حديث عَائِشَةَ رضي الله عنها. [آداب الزفاف ص: (١٩٤-١٩٥)].

**يُسَرِّبُهُنَّ**: دەیگەڕاندنەوە.

واتە: من یاریم دەکرد لەگەڵ هەندێك هاوڕێ لە کاتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتەوە شەرمیان دەکردو دەڕۆیشتن، پێغەمبەری خواش ﷺ دڵی خۆش بوو بەوان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگەڕاندنەوە تا یاری لەگەڵم بکەن.

وە هەر لە ڕێگەی یاریکردنەوە ئەخلاقی چاك و جوان جێگیری دەکات لە منداڵدا وەکو ڕاستگۆیی،و پاراستنی ئەمانەت و جگە لەوانەش، وە ئاگاریشیان دەکەیتەوە لە ئەخلاقی لۆمەکراوە وەکو درۆ،و خیانەت،و فێڵ کردن،و بەکارهێنانی وشەی پیس و جنێودان و جگە لەوانەش.

## ١٥- پاککردنەوەی ماڵ لە ئامێرەکانی مۆسیقا:

لە هۆکارە گرینگەکان و یارمەتیدەرەکان لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ پاککردنەوەی ماڵە لە ئامێرەکانی گۆرانی و مۆسیقا، وە ئەو هۆکارانەشی کە دەبێتە هۆی نیشاندانی کاری خراپ و بەدڕەوشتی و درۆ. بترسێ لەوەی کە شەیتانەکان دابەزن بۆ ئەو ماڵە.

وە لە حەدیسدا هاتوە لە سالمەوە ئەویش لە باوکییەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرمووێت: جبریل (سەلامی خوای لێبێت) بەڵێنیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام دواکەوتبوو، ئەوەش لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ قورس بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچو گەیشت بە جبریل گلەیی ئەوەی کرد کەوا بۆ

تاخير بووە، جبريليش فەرمووی: « إِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ » رواه البخاري[٩٩].[١٠٠]

واتە: ئێمە ناچینە ماڵێكەوە كەوا سەگ‌و وێنەی تێدابێت.

ئەی دەبێت ماڵەكانی زۆرێك لە موسڵمانان لەم ڕۆژەدا چۆن بێت كە وێنەو ئەو هۆكارانەی تێیدایە دەبێتە هۆی گواستنەوەی وێنەی فیتنە بۆ پیاوو ئافرەت‌و وە لە گۆرانی‌و مۆسیقا.

ئایە ئەمە ڕێگە بە دابەزینی شەیتان، وە دورخستنەوەی مەلائیكەت نادات؟!

❁ ئەوە ماڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ جبريل (سەلامی خوای لێبێت) نەچوە ژورەوە لەبەرئەوەی وێنەو سەگی تێدابوو، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە دەركردنی سەگەكە[١٠١] و وێنەكەی دڕاندو دایانخست.[١٠٢]

مەلائیكەت وە لەگەڵ بەرەكەت‌و لەسەرخۆیی‌و ئارامی دێت.

وە شەیتانەكانیش وە لەگەڵ دڵەڕاوكێ‌و تەنگ‌و چەڵەمەو نەخۆشی دەروونی دێت.

---

(٩٩) أخرجه البخاري (٥٩٦٠).

(١٠٠) لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە كە حەسەن‌و حسين (ڕەزای خوایان لێبێت) هێنابوویانە ژوورەوە. صحيح أبي داود (٤١٥٨). –وەرگێر–.

(١٠١) انظر ما جاء في "صحيح مسلم" (٢١٠٥) حديث مَيمُونَةَ رضي الله عنها.

(١٠٢) انظر ما جاء في "صحيح البخاري" (٥٩٥٤) حديث عَائِشَةَ رضي الله عنها.

هیچ سەیرنییە كە دەبینین خاوەن ئەم ماڵانە گلەیی ئەوە دەكەن لەم جۆرە نەخۆشییانە.

### ١٦- بەهێزكردنی ماڵ بە قورئانو زیكرو نوێژكردن تێیدا:

لەو كارانەی تر كە یارمەتیدەرە لەسەر پەروەردەكردنی منداڵ بەهێزكردنی ماڵە بە قورئانو زیكرو نوێژكردن تێیدا، لەبەرئەوەی قورئان خوێندن كاریگەرییەكی گەورەی هەیە لە پاراستنی ماڵ لە شەیتانەكان، وە چونە ژورەوەی مەلائیكەتەكان، وە دابەزینی ڕەحمەتو لەسەرخۆییو خۆشبەختیو حەوانەوەو ئارامگرتن لەسەر خانەوادەی ئەو ماڵە، وە بەهەمان شێوە زیكری خوا.

❁ وە لەو بەڵگانە لەسەر ئەمە فەرموودەی أبي هورەیرەیە (ڕەزای خوای لێبێت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ »[١٠٣].

واتە: ماڵەكانتان مەكەن بە قەبر، شەیتان ڕادەكات لە ماڵێك كە سورەتی (البقره) تێدا بخوێنرێت.

❁ وە لە جابرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: « إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لَا مَبِيتَ لَكُمْ، وَلَا عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ، فَلَمْ يَذْكُرِ اللهَ

---

(١٠٣) أخرجه مسلم (٧٨٠).

عِنْدَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللهَ عِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ »[١٠٤].

واتە: کەسێك چووە ماڵەوە، زیکری خوای گەورەی کرد لە کاتی چونە ژورەوەی‌و لە کاتی خواردنی، ئەوا شەیتان دەڵێت: شوێنی ئێوە نییە لێرە، وە خواردنیشتان نییە، وە ئەگەر کەسێك چوە ژورەوە زیکری خوای نەکرد لە کاتی چونە ژورەوەی، ئەوا شەیتان دەڵێت: شوێنی مانەوەتان هەیە، وەئەگەر زیکری خوای نەکرد لە کاتی خواردنیدا، دەڵێت: شوێنی مانەوەو خواردنیشتان هەیە.

## پەروەردەکردن لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە بۆ چواردە ساڵی

لە پاش ئەوەی منداڵەکە گەیشتە حەوت ساڵی، ئەم تەمەنە چاکترین‌و باشترین‌و بە پیتترین کاتی پەروەردەکردنە، ئەوە تەمەنی ئاڵتونییە بۆ فێرکردن‌و بەتایبەتی بۆ لەبەرکردن؛ لەبەرئەوەی دڵی بەتاڵە لەو سەرقاڵی‌و بیرکردنەوانەی کە کەسانی هەرزەکارو تازە پێگەیشتو بیری لێدەکەنەوە.

ئەم تەمەنە پێغەمبەری خوا ﷺ سوربوو لەسەر فێرکردنی منداڵەکانی هاوەڵان لە کاتێکدا لەم تەمەنە بوونە

❁ لە ابن عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەفەرموێت: لە ڕۆژێکیان لە پشت پێغەمبەرەوە ﷺ بووم لەسەر وڵاغێك فەرمووی: « يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ، احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ

(١٠٤) أخرجه مسلم (٢٠١٨).

فَاسْأَلِ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ »[١٠٥].

واتە: ئەی ڕۆڵە من چەند وشەیەکت فێردەکەم، تۆ سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە خواش تۆ دەپارێزێت، تۆ سنورەکانی شەرعی خوا بپارێزە دەبینیت خوا لەگەڵتدا بە بیستنو بینینو تواناو دەسەڵاتی دەبێت، ئەگەر داوات کرد تەنها داوا لە خوا بکە، ئەگەر داوای یارمەتیت کرد تەنها داوای یارمەتی لە خوا بکە، وەبزانە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ ئەوەی سودێکت پێبگەیەنن ناتوانن جگەلەوەی کە خوای گەورە نوسیویێتی بۆت، وە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆئەوەی زەرەرێکت پێبگەیەنن ناتوانن جگەلەوەی خوای نوسیوێتی بۆت، قەڵەمەکانی نوسینی قەدەر هەڵگیراونو پەڕەکانیش وشك بوونەتەوەو هیچ شتێك گۆڕانی بەسەردا نایات.

ئەمە فەرمودەیەکی گەورەیە کە ابن رجب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەربارەی دەفەرموێت: ئەو فەرمودەیە ئامۆژگاری زۆر گەورەو بنەمای هەموو فەرمانەکانی دینی تێدایە [١٠٦].

---

[١٠٥] حديث صحيح: أخرجه الترمذي (٢٥١٦) وقال: هذا حديث حسن صحيح. [صحيح وضعيف سنن الترمذي (٢٥١٦)].

[١٠٦] انظر: "جامع العلوم والحكم" لابن رجب ﷺ، الحديث التاسع عشر (٤٦٢/١).

پێغەمبەری خوا ﷺ ابن عەبباسی (ڕەزای خوایان لێبێت) فێرکرد کە منداڵ بوو تەمەنی نەگەیشتبووە بالغبوون و پێگەیشتن چونکە پێش هیجرەت کردن بە لە دایکبوو سێ ساڵ.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی حەسەنی فێر دوعای قنوت کرد، لە حەسەنەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرمووێت: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوَتْرِ ... [١٠٧].

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری هەندێك وشەی کردم بیخوێنم لە دوعای قنوتی ویتر ... وە تەمەنی لە خوار دەساڵەوە بوو لەبەرئەوەی لە ساڵی (سێ)ی هیجری لە دایکبوو.

### ١- نوێژ:

وە لەو هەنگاوە کرداری یانەی کە بایەخی پێ بدرێت کە یارمەتیدەرە بۆ ئەم تەمەنە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هانمانیداوە بۆ ئەو کارانە نوێژکردنە وەکو دەفەرمووێت: « مُرُوا أَوْلَادَكُمْ بِالصَّلَاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا، وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرِ سِنِينَ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ » [١٠٨].

---

(١٠٧) حديث صحيح: أخرجه أحمد في "المسند" (٣/٢٤٥) (١٧١٨). [مشكاة المصابيح: (١٢٧٣)، أصل صفة الصلاة النبي ﷺ (٣/٩٧٠)].

(١٠٨) حديث حسن صحيح: أخرجه أبو داود (٤٩٥) مِنْ حديث **عَبد الله بن عَمْرِو** رضي الله عنهما. [صحيح وضعيف أبي داود: (٤٩٥)].

**بە منداڵەكانتان بڵێن نوێژ بكەن كاتێك لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بوون، وە لێیان بدەن[١٠٩] لەسەر ئەوەی كە نوێژ ناكەن لە كاتێكدا لە تەمەنی دە ساڵیدا بوون وە لە یەكتریانیش جیابكەنەوە لەسەر جێ.**

---

(١٠٩) ڕونكردنەوەیەك لەسەر لێدانی منداڵ:

قال الشيخ ابن عثيمين رحمه الله:

الأمر للوجوب، لكن يقيد بما إذا كان الضرب نافعاً ؛ لأنه أحياناً تضرب الصبي ولكن ما ينتفع بالضرب، ما يزداد إلا صياحاً وعويلاً ولا يستفيد، ثم إن المراد بالضرب الضرب غير المبرح، الضرب السهل الذي يحصل به الإصلاح ولا يحصل به الضرر.

لقاء الباب المفتوح (١٨/٩٥).

**واتە: ئەم فەرمانە بۆ واجبە، بەڵام پەیوەستە بەوەی ئەگەر لێدانەكە سودی هەبوو؛ لەبەرئەوەی جاری واهەیە لە منداڵەكەی دەدات بەڵام سودی نییە، هیچ زیاد ناكات لێی جگەلەوەی هاواركردنو گریان وە هیچ سودی نابێت، پاشان مەبەست لە لێدان لێدانێك بێت بەبێ توندو تیژی، لێدانێكی وا بێت بۆ چاككردنی نەك زەرەری لێبدات.**

وقال رحمه الله:

"لا يضرب ضرباً مبرحاً، ولا يضرب على الوجه مثلاً، ولا على المحل القاتل، وإنما يضرب على الظهر أو الكتف أو ما أشبه ذلك مما لا يكون سبباً في هلاكه . والضرب على الوجه له خطره ؛ لأن الوجه أعلى ما يكون للإنسان وأكرم ما يكون على الإنسان، وإذا ضرب عليه أصابه من الذل والهوان أكثر مما لو ضرب على ظهره، ولهذا نهي عن الضرب على الوجه.

(فتاوى نور على الدرب) (١٣/٢).

**واتە: لێدانێك نەبێت بە توندو تیژی، وە لە دەمو چاوی نەدات، وە لەو شوێنانەش نادرێت كە ترسی كوشتنی هەیە، بەڵكو لە پشت یان بان شان وە شوێنەكانی تر كە نەبێتە هۆی بەهیلاكچونی، وە لێدان لە دەمو چاو جێی مەترسییە؛ لەبەرئەوەی دەمو چاو بەرزترین شوێنی ئینسانە وە**

واجبە لەسەر ئەوكەسەی كە خاوەن منداڵە فـەرمان بكـات بـە منداڵەكـەی لەم تەمەنە نوێژ بكات، وە هانیبدات، وە فەزڵ‌و گەورەییەكەی‌و سودەكانی بۆ ڕون بكاتەوە، وە سزای ئەو كەسەشی بۆ ڕون بكاتەوە كە نوێژ ناكات.

ئەگەر منداڵەكەت وا پەروەردە كرد لەسەر خۆشەویستی نوێـژو چـاودێری خوای گەورە ئەو كاتە گەشە دەكـات گەشـەكردنێكی پـاك‌و صـالْح دەبێـت بـە ویستی خوای گەورە؛ لەبەرئەوەی نوێژ ڕێگری دەكات لە خراپـەكاری‌و تـاوان، وە ئیهمـالكردن‌و كەمتەرخـەمی تێیـدا لـە دەسـتدانە چـی لـە دەسـتدانێك، وە

---

بەرێزترین شوێنێتی، وە ئەگەر لە دەم‌و چاوی بـدرێت ئـەوا توشـی سـوكی‌و نزمـی دێـت زیـاتر لەوەی كە لە پشتی بدرێت، بۆیە ڕێگریكراوە لەوەی لە دەم‌و چاوی بدرێت.

وقال الشيخ الفوزان حفظه الله:

الضّرب وسيلة من وسائل التربية، فللمعلِّم أن يضرب، وللمؤدِّب أن يضرب، ولولّي الأمر أن يضرب تأديباً وتعزيراً، وللزوج أن يضرب زوجته على النشور.

لكن يكون بحدود، لا يكون ضرباً مبرحاً يشقّ الجلْد أو يكسرُ العظم، وإنّما يكون بقدر الحاجة.

إغاثة المستفيد بشرح كتاب التوحيد، لاپەرە: (٢٨٢- ٢٨٤)

واتە: لێدان ڕێگەیەكە لە ڕێگەكانی پەروەردەكردن، مامۆستا لە قوتابییەكەی دەدات، فێركـەر لـەوەی لە بەردەستییەتی لێی دەدات، وەلی ئەمر لەو كەسانە دەدات كەهەڵەیان كردووە بۆ ئـەوەی بـە خۆیاندا بچنەوە، وە پیاو لە ژنەكەی دەدات ئەگەر لاساری كرد.

بەڵام دەبێـت لـە سـنوری شـەرع دەرنەچـێت، لێـدانێك نـەبێت بـە تونـدو تیـژی، پێـستی بتـەقێنێت‌و ئێسقان بشكێنێت، بەڵكو بەپێی پێویستە، نەك بەس لەسەر نوێژ نەكردن لێیـان بـدرێت بـەڵكو لەسەر تاخیركردن‌و جوان نەكردنی نوێژو جـاری واهەیـە دوو نوێـژ پێكـەوە دەكـەن یـان بـەبێ دەستنوێژ نوێژەكە دەكەن، پێویستە لەسەر ئەمانەش ئاگاداربكرێنەوەو تەئدیب بكرێن.

-وەرگێڕ-

پــەروەردەو چــاکبوون نییــە لــە دوای لــە دەســتدانی نوێــژ، خــوای گــەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ﴾ [طه: ١٣٢].

واتــە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ﴾ وە تــۆ فــەرمان بــە کەســوکارت یــان بــە ئوممەتەکەت بکە بە نوێژ کـردن ﴿وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ وە ئـارام بگـرە لەسـەر نوێـژ کردنەکەت.

## ٢- فێرکردنی قورئانی پیرۆز:

وە لەو کارە گرنگانەی تر کە یارمەتیدەرە لەسەر پـەروەردەکردنی منـداڵ فێرکردنی قورئانی پیرۆزە.

ئەگـەر بمانـەوێت خێـرو پلەبـەرزی دەسـت بکـەوێت بـۆ منداڵـەکانمان لـە دونیاو قیامەت با سـوربین لەسـەر فێرکردنیـان بـۆ کتێبەکـەی خـوای گـەورەو خوێندنــەوەی و لەبــەرکردنی و تێگەیــشتن لێــی و کردەوەکــردن پێــی. وە بــە تایبەتی لەم قۆناغەدا کەقۆناغی لەبەرکردنە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ » رواه البخاري[110].

واتە: چاکترینتان کەسێکە قورئان فێرببێت و کەسی تر فێر بکات.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ » أخرجه مسلم[111].

---

(110) أخرجه البخاري (٥٠٢٧) منْ حديث عُثْمَانَ ﷺ.

(111) أخرجه مسلم (٨١٧) من حديث عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ.

واتە: خوای گەورە کەسانێك بەم قورئانە بەرز دەکاتەوەو سەردەخاتو کەسانێکیشی پێ دەخاتو نزم دەکاتەوە.

زۆرێك لە زانایانی هەڵکەوتومان قورئانیان لەبەرکردوە پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی بالغ بوونو پێگەیشتن، ئیمام (شافعی) لە تەمەنی حەوتساڵی لەبەری کردوە، وە (ئیمامی نەوەوی) لە دە ساڵی لەبەری کردوە، وە (شێخ ئیسلام) پێش بالغ بوون، وە بەهەمان شێوە شێخ (ابن بان) (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) وە جگە لەوانیش.

وە سەلەفی صالح (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت) سوربوون لەسەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو فێربوونو فێرکردنی منداڵەکانیان.

❁ لە عطاء کوڕی سائب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە باوکی عبدالرحمن سولەمی فەرموویەتی: " أَخَذْنَا القُرْآنَ عَنْ قَوْمٍ أَخْبَرُوْنَا أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا تَعَلَّمُوا عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزُوْهُنَّ إِلَى العَشْرِ الآخَرِ حَتَّى يَعْلَمُوا مَا فِيْهِنَّ، فَكُنَّا نَتَعَلَّمُ القُرْآنَ وَالعَمَلَ بِهِ، وَسَيَرِثُ القُرْآنَ بَعْدَنَا قَوْمٌ يَشْرَبوونَهُ شُرْبَ المَاءِ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ "[١١٢].

واتە: قورئانمان وەرگرت لە کەسانێك هەواڵیاندا پێمان کە ئەوان کاتێك فێری دە ئایەت ببوونایە ناچون دە ئایەتی تر لەبەر بکەن تا نەیانزانیایە چی لەم دە ئایەتە هەیە، ئێمە فێری قورئان دەبووینو کردەوەمان پێی دەکرد، لە دوای ئێمە کەسانێك قورئان وەردەگرن دەیخۆنەوە وەکو ئاو کە لە گەرویان ناچێتە خوارەوە.

---

(١١٢) "سير أعلام النبلاء" (٤/٢٦٩).

پیاوچاکانی پێشوو (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت) سووربوون لەسەر فێربوونی قورئان‌و تێگەیشتن لێی‌و کردەوە پێکردنی، کە ئەوە سەرەکییە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخلاقی قورئان بووە وەکو چۆن عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) هەواڵیداوە[١١٣].

ئەوەی هانی باوکان بدات لەسەر سووربونیان کە منداڵەکانیان فێری قورئان بکەن، ئەوەی هاتوە لەسەر فەزڵ‌و گەورەیی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیداوە لەوانە ڕیوایەتی سەهلی کوڕی موعاذي جوهەنییە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: « مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَعَمِلَ بِمَا فِيهِ أُلْبِسَ وَالِدَاهُ تَاجًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ضَوْءُهُ أَحْسَنُ مِنْ ضَوْءِ الشَّمْسِ فِي بُيُوتِ الدُّنْيَا لَوْ كَانَتْ فِيكُمْ فَمَا ظَنُّكُمْ بِالَّذِي عَمِلَ بِهَذَا؟ »[١١٤]

واتە: هەرکەسێك قورئان بخوێنێت‌و کردەوە بکات لەوەی لە ناوی هاتوە، تاجێك دەخرێتە سەر دایك‌و باوکی لە ڕۆژی دوایدا، ڕوناکییەکەی جوانترە لە ڕوناکی ماڵێك لە دونیا، ئەگەر ئێوە بن ئەوە گومانی چی دەبەن بەو کەسەی ئەم کردارەی کردووە؟.

---

(١١٣) أخرجه أحمد في "المسند" (٣٥٣/٤٢) (٢٥٥٤٧)، وانظر "تفسير ابن كثير" (١٨٨/٨-١٩٠) [القلم: ٤].

(١١٤) حديث ضعيف: أخرجه أبو داود (١٤٥٣)، وأحمد في "المسند" (٤٠٢/٢٤-٤٠٣) (١٥٦٤٥).[صحيح وضعيف سنن أبي داود: (١٤٥٣)].

وە بۆ ئەوەی لە دەستی چوە لەبەری بکات و تەمەنی گەورە بووە و ئێستا قورئان قورسە لەسەری کە بیخوێنێت یان لەبەری بکات، ئەوە با لەدەستی خۆی نەدات کە منداڵەکەی لەبەری بکات، منداڵەکەی کردەوەی چاکن بۆی.

## ٣- پەروەردەکردنیان لەسەر گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ:

لە هەموو پێویستییەك پێویستتر لەسەر دایك و باوكە پەروەردەکردنی منداڵەکانیانە لەسەر گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و بە گەورە دانانی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

وە بیریان بخاتەوە بە ئایەت و فەرمودە کە بەڵگەن لەسەر گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾ [النساء: ٦٩].

واته: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ﴾ پیاوێك لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە غەمبار بو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی فڵانە کەس بۆچی دەتبینم خەفەتباریت؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکە بیرم لێ کردەوە، فەرمووی چیە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین بۆ خزمەتی تۆو تەماشات دەکەین و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەڵام لە قیامەتدا تۆ پلەت بەرزە لەگەڵ پێغەمبەراندایت ئێمە پێت ناگەین، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ

وەڵامی نەدایەوە یەکسەر جبریل ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، پێغەمبەری خوایش ﷺ ناردی بە شوێن پیاوەکەداو موژدەی پێدا: وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکات ﷺ ئەوە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاندوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران‌و ڕاستگۆیان‌و شەهیدان‌و پیاوچاکان ﴿وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا﴾ کە ئەمانەیش باشترین ڕەفیق‌و هاوەڵن کە مرۆڤ هاوڕێیەتی‌و هاوەڵێتیان بکات.

وە گوێڕایەڵی خوای گەورە وا پێویست دەکات بە تاك‌و تەنها عیبادەتی بۆ بکەیت‌و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەیت.

وە خۆشەویستی پێغەمبەری خواو ﷺ گوێڕایەڵی پێویست دەکات لەوەی فەرمانی پێکردوە،و ئەوەش بەڕاست دابنێیت کە هەواڵیداوە،و دورکەوتنەوە لەوەی نەهی لێکردوەو ڕێگری کردەوە،و خواش نەپەرستیت ئیللا بە شەریعەتەکەی ئەو نەبێت.

وە ئاگاداری بکەیتەوە لە سەرپێچیکردنی خوای گەورەو پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هۆکارێکە بۆ چونە ناو ئاگری دۆزەخ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ [الأحزاب: ٦٦].

واتە: ﴿يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ﴾ لەو ڕۆژەدا لەناو ئاگری دۆزەخدا ڕادەکێشرێن‌و دەمو چاو و ڕوویان ئەمدیو و ئەودیو ئەکرێت‌و هەموی ئەسوتێندرێت ﴿يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولاَ﴾ ئەوانیش دەڵێن:

خۆزگە لە دونیادا گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوامان ﷺ بكردایە.

با دایك‌و باوك ببن بە پێشەنگ بۆ منداڵەكانیان چاویان لێبكەن لە جێبەجێكردنیان بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ.

## ٤- پەروەردەكردنیان لەسەر خۆشویستنی زانایان‌و ئەوەی كاروباری -ولاة الأمر- وڵات بەڕێوە دەبات:

لە كارە گرینگەكان كە پێویستە لەسەر باوكان‌و دایكان گرینگیدان بە پەروەردەكردنی منداڵەكانیان لەسەر خۆشویستنی زانایان‌و ولاة الأمر؛ چونكە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێبێت)، وە پێغەمبەران درهەم‌و پارەیان جێنەهێشتوە بەڵكو عیلمیان جێهێشتوە هەر كەسێك وەریبگرێت، ئەوا بەشێكی چاك‌و باشی وەرگرتوە لە میراتەكەیان[115]؛ لەبەرئەوەی گومان دروست ببێت لە خۆیان‌و عیلمیان،و ڕێز نەگرتنیان،و دەرخستنی هەڵەكانیان لەلای منداڵەكان، دەبێتە مەترسیدارییەكی گەورە لەسەر ئوممەت؛ لەبەرئەوەی عیلم وەردەگیرێت لە ڕێگەی ئەوانەوە، وە شەریعەتی ئیسلام لە ڕێگەی ئەوانەوە وەردەگیرێت، بە هۆكاری ئەوە دەبێتە ڕوخان‌و لە دەستدانی شەریعەتی ئیسلام.

---

(١١٥) حديث صحيح: انظر حديث أَبِي الدَّرْدَاءِ رضي الله عنه في "مسند أحمد" (٣٦/٤٥-٤٦) (٢١٧١٥). [صحيح الجامع الصغير وزيادته: (٦٢٩٢)].

وە بەهەمان شێوە كاتێك منداڵ گەورە دەبێت دەگەڕێت لە كێوە عیلم وەربگرێت، وە لە زانایان وەری ناگرێت؛ لەبەرئەوەی گومانی هەیە لە خۆیان‌و عیلمەكەشیان، وە لەوانەیە لە زانایانی گومڕاوە عیلم وەربگرێت، وە خاوەن فیكرە لادەرەكان، بەبۆنەی ئەوەوە ئەو منداڵە ڕێگەیەكە بۆ لەناو بردنی كۆمەڵگە.

بەڵام (ولاة الأمر) ئەوان كارەكانیان بە دەستەوەیە وە شەریعەت جێ بەجێ دەكەن، وە پارێزگاری لە ئەمن‌و ئاسایشی وڵات دەكەن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ﴾ [النساء: ٥٩].

واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە ئیمانتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بكەن ﷺ وە ئەوانەی كە فەرمانڕەواو كاربەدەستی ئێوەن چ فەرمانڕەوایان وە چ زانایان هەردوكی ئەگرێتەوە لە چاكەدا بەڵام لە خراپەو تاواندا گوێڕایەڵی بۆ كەس نییە.

بەداخێكی زۆرەوە هەندێك لە موسڵمانان تێكەوتونە لە دانیشتنیان غەیبەت‌و دوزمانی زانایان‌و سەركردەی وڵات دەكەن، وە هەڵەكانیان ئاشكرا دەكەن‌و دەریدەخەن، وە ئەگەر كەسێك لەوانە سەیری كەم‌و كوڕییەكانی نەفسی خۆی بكات‌و هەڵەكانی سەیر بكات زۆرێك لەوانەی باسی دەكات لە خۆیدا هەیە، « كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ »[116].

---

(116) انظر ما ورد في "صحيح مسلم" (٥)(٥) في مقدمة الكتاب، وأبو داود (٤٩٩٢).

واتە: بەسە بۆ گوناهباری کەسێك هەرچی بیست بیگێڕێتەوە.

بە داخێکی زۆرەوە منداڵەکان دادەنیشن لە شێوەی ئەم مەجلیسو دانیشتنانە، ئەم قسانە دەبیستنو وەری دەگرن، وە باسکردنی زانایان، کە دەبێتە هۆکاری فیتنەو تەبدیع کردنو فاسق کردنیان بەبێ عیلم.

وە لەوانەیە زۆرێك لەو قسانەی کە دەیکەن زۆرێکی درۆبێتو هەڵیان بەستبێتو بەبێ بەڵگەو شایەت، ئەوانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن بڵاوی دەکەنەوە، وە ئەوانەی دوژمنانی ئەم عەقیدە پاکەن کە ئەم دەوڵەتە ئیسلامییەی لەسەر دروست بووە.

❁ شێخ ابن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: لە مەنهەجی سەلەف نییە تەشهیرو ناوزڕاندنی کەمو کورتییەکانی سەرکردەی وڵات، وە گوێڕایەڵی نەکردنیان لە کاری چاکە، وە هاندان بۆ دەرچون لە دەسەڵاتیان کە زەرەری دەبێت نەك سود، بەڵام ڕێگەی شوێن کەوتنی قورئانو سوننەت لای سەلەف ئامۆژگاری کردنیانە لە بەینی ئەو کەسەو سەرکردەکەو نوسین بۆیان بنێریت یان پەیوەندی کردن پێیانەوە بە تەلەفون لەگەڵ زانایان ئەوانەی کە تەلەفون دەکەن بۆیان تا ئەو شتانەیان ئاڕاستە بکەن بەرەو خێر[١١٧].

مەنهەجی سەلەف ئینکاری کردنی تێدانییە بە ئاشکراو ناوزڕاندن بە هەڵەکانی سەرکردەی وڵات بەرانبەر خەڵکی چونکە خراپەی گەورەی لێدەکەوێتەوەو خەڵکی هاندەدات دژیان هەڵسن.

---

(١١٧) "المعلوم من واجب العلاقة بين الحكام والمعلوم" لاپەڕە: (٢٢).

وَقَدْ قِيلَ لِأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: " أَلَا تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ؟ فَقَالَ: أَتَرَوْنَ أَنِّي لَا أُكَلِّمُهُ إِلَّا أُسْمِعُكُمْ؟ وَاللهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ، مَا دونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ"[١١٨].

وقال القاضي عياض رحمه الله مراد أسامة أنه لا يفتح باب المجاهرة بالنكير على الإمام لما يخشى من عاقبة ذلك بل يتلطف به وينصحه سرا فذلك أجدر بالقبول.[١١٩]

واتە: بە ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خوایان لێبێت) پێی وترا: ئەوە بۆچی بۆلای عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) قسەی لەگەڵ بکەیت؟ فەرمووی: ئێوە وا دەبینن قسەم نەکردوە لەگەڵی ئیللا ئەوە نەبێت کە ئێوە نەیبیستن؟ سوێند بەخوا قسەم کردوە لە بەینی خۆم و ئەودا، نامەوێت دەرگایەك بکەمەوە پێمخۆش نییە بمبە یەکەم کەس.

القاضي عياض (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: مەبەستی ئوسامە (ڕەزای خوای لێبێت) دەرگایەك ناکەمەوە ببێتە ئینکاری لەسەر ئیمام لە ترسی سەرەنجامەکەی، بەڵکو بە نەرمو نیانی ئامۆژگاریم کردوە بە نهێنی ئەوە زیاتر جێگەی وەرگرتنە.

---

(١١٨) أخرجه أحمد في "المسند" (٣٦/١١٧) (٢١٧٨٤)، والبخاري (٣٢٦٧)، ومسلم (٢٩٨٩) واللفظ له.

(١١٩) "فتح الباري" (١٣/٦٧) (٧٠٩٨).

 شـێخ ابـن عثـیمین (ڕەحمــەتی خــوای لێبێـت) ئــەم مەنهەجــە ڕون دەكاتــەوە فەرموويــەتی: هەنـدێك لـە خـەڵكی ڕاهاتونـە لـە هـەموو مـەجلیسو دانیشتنێك قسە لەسەر سـەرکردەی وڵات دەکـەنو دەکەونـە باسـکردنیان، وە کەمو کوڕیو هەڵەکانیان بڵاودەکەنەوە، ئەوەی کە هەیانە لـە باشـیو ڕاسـتی بخرێتەڕو، وە ئەمە هیچ گومانێکی تێدانییە ئەم ڕێگایەو کەوتنە ناو باسکردنی سەرکردەی وڵات هیچ شتێك زیاد نەکات ئیللا ناڕەحـەتی نـەبێت، لەبەرئـەوەی ئەمە کێشە چارەسەر ناکاتو زوڵمـیش لانابـات، بـەڵکو بـەڵاو موسـیبەت زیـاد دەکات، دەبێتە ئەوەی ڕق لە کاربەدەستان بگیرێت، وە گومـانی تێدانییـە کـە سەرکردەی وڵات خراپە دەکەنو هەڵە دەکەن وەکو غەیری ئەوانیش لە نەوەی ئـادەم (سـەلامی خـوای لێبێـت ، چـونکە هـەموو نـەوەی ئـادەم هەڵـەو تـاوان دەکەن، وە چاکترینیان ئەوەیـە پەشـیمان دەبنـەوە، وە گومانیـشی تێدانییـە دوبارە کە نابێت بێدەنگ بین کاتێك کەسێك توشی هەڵە دەبێـت هـەوڵی ئـەوە بدەین کە بۆمان دەکرێت پێویستە ئامۆژگاری بکـەین بـۆ خـواو بـۆ کتێبەکـەی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و بـۆ پێـشەوای موسـڵمانانو سـەرجەم موسـڵمانان، ئەگەر بەم شێوازە بوو ئەوە پێویستە لەسەر ئێمە کاتێك بینیمان سـەرکردەی وڵات هەڵەیەکی کرد پەیوەندی پێوە بکەینو بە دەم پێی بڵێین یان بە نوسـین وە ئامۆژگارییـان بکـەین بـەو شـێوازەی نـزیکترین ڕێگابیـت لـە ڕونکردنـەوەی حـەقو شـەرحی هەڵـەکانی، پاشـان ئامۆژییـان دەکـەینو یادیـان دەخەینـەوە

ئەوەی لەسەریان واجب‌و پێویستە لە ئامۆژگاریكردنیان بۆ ئەوانەی لەژێر دەستیاندان‌و چاودێریكردنی مەسڵەحەتیان‌و لابردنی زوڵم لەسەریان.[١٢٠]

وە شێخ صالح الفوزان (خوا بیپارێزێت) دەفەرموویێت: قسەكردن لەسەر سەركردەی وڵات لە غەیبەت‌و دوزمانییە، كە ئەو دوانە لە سەختترین تاوانەكانە پاش شیرك، وە بەتایبەت ئەگەر ئەو غەیبەت‌و دوزمانییە باسی زانایان‌و سەركردەی وڵات بێت ئەمە سەختترە؛ لەبەرئەوەی هەندێك خراپەی تری لێدەكەوێتەوە لە جیاوازی یەك ڕیزی موسڵمانان‌و گومان خراپ بردن بە سەركردەی وڵات، بێ ئومێدی‌و بێ هیوایی لە نەفسی خەڵك جێگیر دەبێت[١٢١].

## زانایان لە پێشینان‌و ئەوانەی دوای ئەوانیش هەندێك فەرمودە كە جێگیربووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوە:

١- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الجَمَاعَةَ شِبْرًا فَمَاتَ، إِلَّا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً»[١٢٢][١٢٣].

---

(١٢٠) "وجوب طاعة السلطان في غير معصية الرحمن" للعريني، لاپەڕە: (٢٣-٢٤).

(١٢١) "الأجوبة المفيدة عن أسئلة المنهج الجديدة" لاپەڕە: (٦٠).

(١٢٢) أخرجه أحمد (٤/٢٩٠) (٢٤٨٧)، والبخاري (٧٠٥٤) و (٧١٤٣) ومسلم (١٨٤٩) (٥٥).

(١٢٣) قال الطيبي رحمه الله: فمات على هيئة كان يموت عليها أهل الجاهلية؛ لأنهم ما كانوا يرجعون إلى طاعة أمير فلا يتبعون هدى إمام بل كانوا مستنكفين عنها مستبدين في الأمور لا يجتمعون في شيء ولا يتفقون على رأي. "مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح" (٦/٢٣٩٤) (٣٦٦٨).

واتە: مردنەكەی لەسەر شێوەی مردنی نەفامەكانی پێش ئیسلامە، چونكە ئەوان ناگەڕانەوە بۆلای گوێڕایەڵی ئەمیرەكەیان لەسەر ڕێگای ئیمامێكیان نەبون، بەڵكو ڕێگربونە لەوەو

واتە: لە ابن عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) فەرموویەتی: هەرکەسێك لە ئەمیرەکەی شتێکی لێ بینی با ئارام بگرێت لەسەری چونکە هەرکەسێك دەربچێت لە کۆمەڵی موسڵمانان بستێك و بمرێت، بەشێوەیەکی نەفامی مردوە.

٢- عَنْ زِيَادِ بْنِ كُسَيْبٍ العَدويِّ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ تَحْتَ مِنْبَرِ ابْنِ عَامِرٍ وَهُوَ يَخْطُبُ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَقَالَ أَبو بِلَالٍ: انْظُرُوا إِلَى أَمِيرِنَا يَلْبَسُ ثِيَابَ الْفُسَّاقِ، فَقَالَ أَبو بَكْرَةَ: اسْكُتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: « مَنْ أَهَانَ سُلْطَانَ اللَّهِ فِي الأَرْضِ أَهَانَهُ اللَّهُ»[١٢٤].

واتە: لە زیادی کوڕی کوسەیبی عەدەوەی دەفەرمووێت: لەگەڵ أَبِي بَكْرَةَ لە ژێر مینبەرەکەی ابن عامر بووین ئەو وتاری دەدا پۆشاکێکی ناسکی لەبەربوو، أبو بیلال وتی: سەیری ئەمیرەکەمان بکە پۆشاکی فاسقەکانی پۆشیوە، أبو بکرە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: بێدەنگبە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: هەرکەسێك سوکایەتی بە فەرمانڕەوای خوا بکات خوای گەورە سوکایەتی پێدەکات.

---

هەرکەسێکیان ڕەئی خۆی هەبوە لە کارەکان کۆنابوونەوە لەسەر هیچ شتێك وە یەك دەنگ نابوون لەسەر بۆچونێك. -وەرگێڕ-.

(١٢٤) حديث حسن: أخرجه أحمد في "المسند" (٧٩/٣٤) (٢٠٤٣٣)، صحيح وضعيف سنن الترمذي: (٢٢٢٤).

٢- عِيَاضُ بْنُ غَنْمٍ قالَ: قالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَرَادَ أَنْ يَنْصَحَ لِسُلْطَانٍ بِأَمْرٍ، فَلَا يُبْدِ لَهُ عَلَانِيَةً، وَلَكِنْ لِيَأْخُذْ بِيَدِهِ، فَيَخْلُوَ بِهِ، فَإِنْ قَبِلَ مِنْهُ فَذَاكَ، وَإِلَّا كَانَ قَدْ أَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ لَهُ»[١٢٥].

واتە: عیاض كوڕی غەنم (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە ویستی ئامۆژگاری سەركردەكەی بكات، با بە ئاشكرا نەبێت، با پەنهانی بێت، ئەگەر وەری گرتو قبوڵی كرد ئەوە لەسەر ئەو لاچوو، وە ئەگەر وەریشی نەگرتو قبوڵی نەكرد ئەوا ئەوحەقەی لەسەری بوو گەیاندی.

٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: نَهَانَا كُبَرَاؤُنَا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَسُبُّوا أُمَرَاءَكُمْ، وَلَا تَغِشُّوهُمْ، وَلَا تَبْغَضُوهُمْ، وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاصْبِرُوا؛ فَإِنَّ الْأَمْرَ قَرِيبٌ»[١٢٦].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە (ڕەزای خوای لێبیت) فەرموویەتی: ڕێگریمان لێكراوە لەلایەن گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویانە: جنێوو قسەی ناشرین مەدەن بە سەركردەكانتان، وە فێڵیان لێ مەكەن، وە ڕقتان لێیان نەبێت، وە تەقوای خواتان هەبێتو ئارام بگرن، قیامەت نزیكە.

٤- عَنْ زِيَادِ بْنِ كُسَيْبٍ العَدَوِيِّ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ تَحْتَ مِنْبَرِ ابْنِ عَامِرٍ وَهُوَ يَخْطُبُ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَقَالَ أَبُو بِلَالٍ: انْظُرُوا إِلَى أَمِيرِنَا يَلْبَسُ

---

(١٢٥) أخرجه أحمد (٢٤/٤٨-٤٩) (١٥٣٣٣)، وابن أبي عاصم في "السنة" (٢/٥٠٧) (١٠٩٦).

(١٢٦) أخرجه ابن أبي عاصم في "السنة" (٢/٤٧٤) (١٠١٥)، والبيهقي في "الجامع لشعب الإيمان" (١٠/٢٧) (٧١١٧).

ثِيَابَ الفُسَّاقِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: اسْكُتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: « مَنْ أَهَانَ سُلْطَانَ اللَّهِ فِي الأَرْضِ أَهَانَهُ اللَّهُ»[١٢٧].

واتە: لە زیادی کوڕی کوسەیبی عەدەوەی دەفەرموێت: لەگەڵ أَبِي بَكْرَةَ لە ژێر مینبەرەکەی ابن عامر بووین ئەو وتاری دەدا پۆشاکێکی ناسکی لەبەربوو، أبو بیلال وتی: سەیری ئەمیرەکەمان بکەن پۆشاکی فاسقەکانی پۆشیوە، أبو بکرە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموی: بێدەنگبە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوە فەرمویەتی: هەرکەسێك سوکایەتی بە فەرمانڕەوای خوا بکات خوای گەورە سوکایەتی پێدەکات.

## ٥- هەڵبژاردنی قوتابخانە:

پێویستە لەسەر باوك کە سور بێت لەسەر هەڵبژاردنی چاکترین قوتابخانە، باشترینو گونجاوترین هەڵبژێرێت نەك نزیکترین، وە پرسیار بکات لە کەسانی پەروەردەو فێرکردن کە ئامۆژگاریکارن دەربارەی چاکترین قوتابخانەکان.

وە قوتابخانە کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر قوتابی، کە چوار یەکی ڕۆژەکەی لەوێ بەسەر دەبات، کە باشترینی کاتەکانییەتی، لە قوتابخانە فێردەکرێت، وە لەوێ پەروەردە دەکرێت، وە لەوێ هاوڕێو هاودەم دەبینێ.

بۆیە پێویستە لەسەر باوك کە پەیوەندییەك ببەستێت بە قوتابخانەوە بە سەردانیکردنی، وە بە تەلەفونکردن، وە پرسیارکردن دەربارەی دۆخی

---

(١٢٧) حديث حسن: أخرجه أحمد في "المسند" (٧٩/٣٤) (٢٠٤٣٣)، والترمذي (٢٢٢٤) واللفظ له، وقال هذا حديث حسن غريب. [صحيح وضعيف سنن الترمذي: (٢٢٢٤)].

کوڕەکەی یان کچەکەی، وە لەسەر ئەخلاق‌و ئەدەب‌و هاوڕێکانی پێش پرسیارکردن لە نمرەکەی.

وە بەهەمان شێوە بە دوای خوێندنەکەی‌و وەرگرتنی عیلمی بگەڕێت، وە بەدوای دەفتەری واجباتەکانی، وە زانینی تێبینییەکانی مامۆستاکەی لەسەر منداڵەکەی تا چارەسەری بکات.

گرنگی پێدانت بە خوێندنی منداڵەکەت، وە پەیوەندی پتەوت.

## ٦- هەڵبژاردنی هاوڕێ:

گومانی تێدانییە کە هاوڕێ کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر هاوڕێ بە باشی بێت یان بە خراپە، ئەوەندەمان بەسە بۆمان ڕون ببێتەوە بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ، وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ، كَحَامِلِ الْمِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ » [١٢٨].

واتە: نمونەی هاوڕێی چاك‌و هاوڕێی خراپ وەکو هەڵگری بۆن‌و ئاسنگەرە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ » أبو داود[١٢٩].

واتە: پیاو لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، با هەرکەسێك تەماشا بکات هاوڕێیەتی کێ دەکات.

---

(١٢٨) أخرجه البخاري (٥٥٣٤)، ومسلم (٢٦٢٨)، وأحمد في "المسند" (٣٩٩/٣٢) (١٩٦٢٤) مِنْ حديث أَبِي موسى الأشعري ﷺ.

(١٢٩) حديث حسن: صحيح وضعيف أبي داود (٤٨٣٣).

لەسەر تۆیە ئەی باوك بگەڕێی بە دوای هاوڕێی چاكو مەجلیسی چاك بۆ منداڵەكەت پێش ئەوەی خۆی هەڵیبژێرێت، جاری واهەیە هەڵبژاردنەكەی هەڵەیە، پەیوەستیش دەبێت پێیانەوە، وە پاشان قورسیشە وازیان لێبهێنێت.

ڕوداوەكان زۆر زیاترن لەوەی بژمێردرێن لەسەر گەنجانێك كە پەروەردە بوونە لە ژینگەیەكی پاك،و ماڵێكی پارێزراو، پاشان تێكەڵی كردوە لەگەڵ كەسانی خراپ بە پاساوی سەفەركردنو گەڕانو یاریكردنو دڵنەوایيو خوێندن كاریگەرییەكی خراپیان لەسەر دروست كرد.

لەم سەردەمەدا قورسە پەروەردەی منداڵەكەت بكەیت لەسەر خۆبەدورگرتنو تێكەڵ نەبوون لەگەڵ هاوڕێ، فیتنە بە تەواوی دەوری گەنجی داوە لە هەموو ڕویەكەوە.

هەندێكجار بگرە هاوڕێ خراپەكانی هاوەڵی هەواو ئارەزووبن یان شوبهەو بیدعەبن، هاوەڵی هەواو ئارەزوو دەیبەن بەرەو خراپەو لادانی ئەخلاقی، وە هاوەڵی شوبهەو بیدعەش دەیبەنو ڕایدەكێشن بەرەو بیدعەو پێچەوانەی ڕێگای سەلەفی صالح، وە لەوانەیە بكەوێتە ناو كافركردنی خەڵكو تەبدیع كردنی موسڵمانان، وە بەتایبەتی لە هاوەڵانی ئەو مەنهەجانەی كە هاتونەتە ئەم وڵاتەوە، هەروەكو دەبینیت لە هەندێك لە گەنجەكانمان خوا هیدایەتیان بداتو بیانگەڕێنێتەوە بۆ حەق گەڕانەوەیەكی جوان.

لە كۆتایدا: داوا دەكەم لە خوای گەورە نییەتو نەوەكانمان بۆ هەمومانی چاك بكات وە لە دایكو باوكمان خۆش ببێت، وە پاداشتی خێریان بداتەوە چاكترین پاداشت، وە یارمەتیمان بدات لەسەر چاكەكردن لەگەڵیان لە ژیانو

دوای مردنیان، وە داوا دەکەم کە یارمەتیمان بدات لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکانمان لەسەر قورئان و سوننەت، وە نەوەی چاکمان بداتێ و بیکاتە بیلبیلەی چاومان لە ژیانی دونیامان بە چاکبوونیان، وە بە کردەوەی چاکیان لە پاش مردنمان.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

# نـــاوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پێشەكی زانای پایەبەرز الشیخ صالح بن فوزان الفوزان | ٤ |
| پێشەكی نوسەر | ٥ |
| منداڵ نیعمەتێكە لە نیعمەتو بەخششەكانی خوای گەورە | ٧ |
| خەڵكی چوار بەشە | ٨ |
| منداڵ ڕازاوەو جوانییە وە بەڵاو تاقیكردنەوەیە | ٩ |
| ١– منداڵ ڕازاوەو جوانییە | ٩ |
| ٢– منداڵ بەڵاو تاقیكردنەوەیە | ١٠ |
| ٣– منداڵ دایكو باوك سەرقاڵیان دەكەن لە گوێڕایەڵی خوای گەورە | ١١ |
| پاڕانەوەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت)و | ١٣ |
| پیاوچاكان لە خوای گەورە بۆ ئەوەی منداڵی چاكیان پێببەخشێت | |
| پاڕانەوەی پێغەمبەر زەكەریا(سەلامی خوای لێبێت) | ١٣ |
| وە لە پاڕانەوەی پیاوچاكان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) | ١٣ |
| سودی منداڵی چاك | ١٤ |
| منداڵ نیعمەتێكە لە نیعمەتەكانی خوای گەورە | ١٤ |
| واجبێتی پەروەردەكردنی منداڵ | ١٦ |
| هیدایەتو ڕێنومایی دوو جۆرە | ١٨ |
| هەنگاوە كردارییەكان بۆ پەروەردەكردنی منداڵ | ٢٠ |
| ١– یەكەم شت دەست پێدەكەین لە چاككردنی نەفسی خۆمان | ٢٠ |
| ٢– هەڵبژاردنی هاوسەر | ٢١ |
| ئافرەتیش هەوڵبدات بۆ پیاوێكی چاك | ٢٥ |
| ٣- بِسْمِ الله بكات پێش چوونە لای خێزانی | ٢٧ |
| ڕونكردنەوەیەك لەسەر زیكری چوونەلای خێزان: (پەراوێز) | ٢٧ |